


زنجیرە بڵاوکراوەکانی
کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان
ژمارە (١)   ٢٠٠٧

بەندی یەکەمی کێتێبی بنەماکانی پەرستاری

# کاری پەرستاری مێژوویی و سەردەم

# Historical and Contemporary Nursing Practice






نووسینی: کۆزیر و ئێرب

وەرگێران: حەمدیە میرخان پیرانی
ماستەر لە زانستی پەرستاری

زنجیره بڵاوکراوەکانی
کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان
ژمارە (١)




بەندی یەکەمی کتێبی بنەماکانی پەرستاری
**First Chapter of Fundamental of Nursing**

# کاری پەرستاری مێژوویی و سەردەم
# Historical and Contemporary Nursing Practice

وەرگێڕان و ئامادە کردن

## حەمدیە میرخان ئەحمەد پیرانی

ماستەر لە زانستی پەرستاری

چاپی یەکەم

کوردستان – هەولێر ٢٠٠٧

به ناوی خوای گەورە و میهرەبان

# کاری پەرستاری مێژوویی و سەردەم

# Historical and Contemporary Nursing Practice

وەرگێران لە کتێبی: بنەماکانی پەرستاری (Fundamental of Nursing)

نووسینی: کۆزیر و ئێرب – ۲۰۰۷

وەرگێر: حەمدیە میرخان پیرانی

کۆمپیوتەر: وەرگێر

چاپ: چاپخانەی منارە – هەولێر

ساڵی چاپ: ۲۰۰۷

تیراژ: ٥٠٠ دانە

نرخ: (۲٥٠٠) دینار

چاپ/ چاپی یەکەم

بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (۱۰۲٦) ساڵی ۲۰۰۷ پێدراوە.

# ناوەڕۆك

لاپەرە

# پێشەکی وەرگێڕ

لە وڵاتانی پێشکەوتوو و تەنانەت وڵاتانی دەوروبەری ئێراق پیشەی پەرستاری لە سیستەمی تەندروستی جێگایەکی گرنگ و بەرچاوی هەیە و پەرستاران زیادتر جەخت دەکەن لە سەر ئەرك و رۆڵی خۆیان. بەداخەوە پیشەی پەرستاری لە کوردستان و بە گشتی لە ئێراق لە ئاستی جیهانی دووا کەوتووە. بە تێڕوانینی من سیستەمی تەندروستی لە کوردستان ڕێگا خۆشکەر نەبووە بۆ ئەوەی کە پەرستاران هەست بە لێپرسراویەتی گرنگی خۆیان بکەن بەرامبەر بە تەندروستی کۆمەڵگا و نەیانتوانیوە رۆڵی خۆیان ببینن. ئەمە وای کردووە کە پەرستارانیش بە داخەوە قەبوڵ بکەن کە رۆڵێکی گرنگیان نیە لە چاودێری بوارەکانی تەندروستی و خۆیان بە شتێکی کەم بزانن. ئەمەش بووەتە هۆی دوواکەوتوویی پیشەی پەرستاری، بایەخ پێ نەدانی ئەندامانی تیمی تەندروستی بە پەرستار، ون بوونی ماندوویەتی پەرستارانی چالاك و نەبوونی ڕێزلێنانی پێویست و شایستەی کەسایەتی پەرستار لە لایەن کۆمەڵگا دا.

بەهەرحاڵ خاڵی دەستپێك بۆ گۆڕینی ئەم بارودۆخە خودی پەرستارانن. وەك پەندێکی پێشینان دەڵێت: هەر کاتێك کە ماسی لە ئاو بگیرێت، تازەیە.

پەرستارانی خۆشەویست دەبی خۆیان هەوڵ بدەن و ماندوو بکەن بۆ ناساندنی خۆیان، دیارکردنی جێگای گرنگیان لە تیمی تەندروستی و بەرز کردنی ئاستی چاودێری پەرستاری لە کوردستان. بەرزکردنی ئاستی زانیاری و زانستی: یەکەمین و پێویست ترین هەنگاوە بۆ کاریگەر بوونی هەوڵەکانیان. کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان بۆ ئەم مەبەستە گرنگە دامەزراوە.

ئەم کتێبە مێژوو و بەسەرهاتی پیشەی پەرستاری روون دەکاتەوە و رۆڵ و جێگای پەرستاری لە رابردوو و ئێستا بە خوێنەران دەناسێنێت. هیوادارم ئەم پەرتووکە زانیاری خەڵك دەربارەی پیشەی پەرستاری زیاد بکات بە شێوەیەك کە بتوانن جێگای گرنگی پەرستار و پیشەی پەرستاری لە ناو تیمی تەندروستی وەسف بکەن. هەروەها خوێنەرانی پەرستاریش شانازی بە پیشەی خۆیان بکەن.

بە هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو پەرستارانی کوردستان.

حەمدیە میرخان پیرانی
٢٠٠٧

# کاری پەرستاری مێژوویی و سەردەم

پەرستاریی ئەمڕۆ زۆر جیاوازە لە پەرستاریی ساڵانی پێشوو و پێدەچێت لە سەدەی بیستەم دا گۆڕانکاری زیاتر بەسەردا بێت. بۆ ئەوەی بگەین بە پەرستارییەکی گشتگیر و لە هەمان کاتدا خۆ ئامادەکردن بۆ داهاتوو نەک تەنیا دەبێت لە مێژوو و بەسەرهاتی پیشەی پەرستاری تێبگەین بەڵکو دەبێت لە پەرستاری ئێستاش تێبگەین و لەو فاکتەرە کۆمەڵایەتیانە کە کاریگەرن لە سەر پەرستاریدا بکۆڵینەوە.

## تێڕوانینی مێژوویی

پێویستییەکان و کاریگەرییەکانی کۆمەڵایەتی گۆڕانکارییەکی کارتێکەریان بە سەر پەرستاری هێناوە. تەماشاکردنی دەستپێکی پەرستاری ئەوە ئاشکرا دەکات کە لە هەوڵ و تێکۆشانی بەردەوام بووە بۆ بوون بە پیشە و گەیشتن بە سەربەخۆیی لە ساڵانی رابردوودا. ئەنجامی گەڕان بە دووای مێژووی پەرستاریدا بووەتە هۆی گەشەکردنی چاپەمەنی و بڵاوکراوەی زۆر سەبارەت بە پەرستاری. ئەم بڵاوکراوانە تەنیا ئەو رووداوانە روون دەکاتەوە کە کاریگەریان

هەبووە لە سەرکاری پەرستاری. ئەم بابەتانە وەك رۆڵ و باروودۆخی ئافرەتان. بەهاکانی ئایینی مەسیحی، شەڕ، پۆچوونەکانی کۆمەڵایەتی، تێروانینی دووربینانەی پەرستارە پێشرەوەکان کاریگەریان هەبووە لەسەر کاری پەرستاری لە رابردوودا. زۆر لەم فاکتەرانە ئێستاش کاریگەرییان ماوەتەوە.

## رۆڵی ئافرەتان

بەپێی داب و نەریتی کۆن، رۆڵی هاوسەریتی، دایکایەتی و کچایەتی و خوشکایەتی ئافرەت هەمیشە بریتی بووە لە چاودێری کردن و بەخێو کردنی ئەندامەکانی خێزان. هەر لە سەرەتای مێژوودا ئافرەتان ئەرکی چاودێری کردن و بەخێوکردنی شیرخۆرەکان و منداڵنیان لە ئەستۆدا بووە. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین رەگ و ریشەی پەرستاری لە ماڵەوەیە. هەروەها، ئەو ئافرەتانەی کە خزمەتکار بوون، داوایان لێکراوە بۆ چاودێری کردنی نەخۆش لە ماڵاندا. بە گشتی، ئەو چاودێرییانە بریتی بوون لە چاودێری جەستەیی و دابینکردنی ئاسوودەیی. بەم شێوەیە رۆڵی مرۆڤانەی چاودێری کردن و بەخێو کردن و ئاسوودە کردن و پاراستن و یارمەتیدان تا هەتایە بۆ کاری پەرستاری پێویست کراوە.

## ئایین

هەروەها ئایین رۆڵی گرنگی بینیوە لە گەشەکردنی پەرستاری. هەرچەندە زۆربەی ئایینەکانی دنیا هانی چاکی دەدەن، ئەو بەهایەی ئایینی مەسیحیەت

کە دەڵێت: " دراوسێی خۆتان وەك خۆتان خۆش بوێت" و چیرۆکی "سامری چاك" ی مەسیحی، کاریگەری هەبووە لە سەر گەشەکردنی پەرستاری لە ڕۆژئاوا دا. لەسەدەی سێیەم و چوارەمدا هەندێك ئافرەتی زەنگینی ئیمپراتۆری ڕۆم، وەك "فابیولا" بووە بە مەسیحی و سەروەت و سامانی خۆی بۆ دروست کردنی خانوو بۆ چاودێری کردن و چاك بوونەوە ( وەك نەخۆشخانە) تەرخان کرد بۆ خەڵکی هەژار و نەخۆش و ئەو کەسانەی کە بێ خانوو و ماڵ بوون. لە گەڵ ئەوەشدا تەنیا ئافرەتان پێشکەشکاری خزمەتی پەرستاری نەبوون. بەڵکو شاسوارانی جەنگی ئاییني وەك "سانت جۆنی ئۆرشەلیم" ( کەبە شاسواری نەخۆشخانەدار ناودارە) ، "تیوتونیك" و "سانت بەلازاروس" کە برای یەکتربوون لە ناو لەشکردا چاودێریی نەخۆش و سەربازە برینداره‌کانیان دەکرد. ئەمانە هەروەها نەخۆشخانەیان دروست کرد و بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی نەخۆشخانەکان لە ئەوروپا پێوەریان دانا. شاسوارەکانی "سانت لازراوس" (وێنەی ١) خۆیان بەخت کرد بۆ چاودێری کردنی ئەو خەڵکانەی کە نەخۆشی گەڕی (Leprosy )، سیفلیس و نەخۆشیەکانی درێژخایەنی پێستیان هەبوو. گرووپی یاریدەدەرانی قەشەکان کە بە ڕەچەڵەك لە ئیمپراتۆری ڕۆم بوون لە سەدەی سێیەم و چوارەمدا، لە سەدەکانی ناوەراست بەدەستی کلیسای ڕۆژئاوا سەرکوت کران، ئەم گرووپە خزمەتی پەرستاریان ئەنجام دەدا. ئەمانە جارێکی تر لە ساڵی ١٨٣٦ دا کاتێك دەستیان بەکارەکانی خۆیان کرد کە

"تیۆدۆر فلیدنر" دووبارە ڕێکخراوی یاریدەدەرکانی قەشەکانیان دامەزراند و نەخۆشخانەیەکی بچوك و قوتابخانەیەکی بۆ ڕاهێنان لە "کازروز" ی ئەڵمانیا کردەوە. فلۆرانس نایتینگل ڕاهێنانی پەرستاری خۆی لەم قوتابخانەیە ئەنجامداوە.

لە سەرەتادا بەهاکانی ئاینی وەك خۆنەویستی (گوێ نەدان بەسوود و ئاسوودەیی خۆ)، کاری مەعنەوی و خۆتەرخان کردن بۆ ئەرك و کاری قورس. لە کاری پەرستاریدا زاڵ بوون. ڕێبازی ئەم پەرستارانە کە بیر و باوەڕیان بەم بەها ئاینیانە هەبوو وای کرد کە لە ڕووی پاداشتی مادی بچەوسێترێن. هەندێك جار پەرستاران دەیانگوت کە ئەوە شتێکی گونجاو نیە ئیمە چاوەڕێی شتی مادی بکەین لەم خۆتەرخان کردنە.



وێنەی ١: شاسوارەکانی "سانت لازاروس" خۆیان بەخت کرد بۆ چاودێری کردنی ئەو خەڵکانەی کە نەخۆشی گەری، سیفلیس و نەخۆشیەکانی درێژخایەنی پێستیان هەبوو. لە سەرەتای ژیانەوە تاکو ناوەڕاستی سەدەی ( ١٣ ) گەری نەخۆشیەکی بێ چارەسەر بوو.

# شەڕ

بەدرێژایی مێژوو، لە شەڕەکاندا پەرستارێتی خۆی سەپاندووە. لە کاتی شەڕی کریمن (Crimean) دا لە ساڵانی ١٨٥٤-١٨٥٦، کەم وکورتی لە چاودێری کردن لە سەربازەکان، بووە هۆی نارەزای دەربڕین لە بەریتانای گەورە. ڕۆڵی فلۆرانس نایتینگڵ لە خستنەرووی ئەم گرفتە بەرز و دیارە. ئەم خاتوونە داوا لە "سیدنی هێربێرت" بەرپرسی بەشی شەڕی بەریتانی کرد کە کۆمەڵێك پەرستاری ئافرەت بهێنێت بۆ ئەنجامدانی کاری چاودێری لە نەخۆشەکان و برینداران لە کریمن. نایتینگڵ و پەرستارەکانی، بە داکۆکی کردن لە پاك و خاوێنی وەك دەست شوشتن و شوشتنی جل و بەرگ بەرێك وپێکی گۆرانکاریان بەسەر نەخۆشخانەی لەشکەریدا هێنا. نایتینگڵ ناوبانگی دەرکرد بەئەنجامدانی موعجیزە، بۆ نموونە لەنەخۆشخانەی "باراك" لە تورکیا ڕێژەی مردن لە ٤٢ ٪ بووە بە ٢٪.

لە کاتی شەڕی ناوخۆیی ئەمریکا (١٨٦١-١٨٦٥)دا، چەندین پەرستار بە دیار کەوتن کە بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش بەشداریان لەم شەڕە ناوخۆیەدا کرد. "سۆجۆرنر تراس" و "هەریت تۆبمەن" (وێنەی ٢و٣) چاودێری ئەو کۆیلانەیان دەکرد کە بۆ باکوور هەڵاتبوون و لە ژێر زەوی و لە تونێلەکانی شەمەندەفەر ژیانیان بەسەر دەبرد، هەروەها ئاسوودەییان بۆ ئەوانە دەستەبەر دەکرد . دایکە "بیکردیك" و " کلارا بارتون " لە ناو مەیدانی شەڕدا دەگەڕان بۆ چاودێری

سەربازە بریندار و مردووەکان، هەروەها "والت ویتمەن و لویزا مای ئەلکوت" ئەو پەرستارانە بوون کە خۆبەخشانە چاودێری سەربازە برینداره‌کانیان دەکرد لە نەخۆشخانەکانی لەشکری. ڕێبەرێکی تری ئافرەت کە چاودێری پەرستاری ئەنجام داوە لەکاتی شەڕدا "دوروتا دیکس " بوو، ئەم خانمە بەرپرسیاریێتی یەکێتی پەرستارانی ئافرەتی لە ئەستۆ گرت بۆ وەرگرتنی پەرستارانی نوێ و سەرپەرشتی کردنی هەموو ئەوانەی کە لە نەخۆشخانەکانی لەشکریدا کاریان دەکرد.



وێنەی ٢: "سۆجۆرنر تراس" (١٧٩٧-١٨٨٣)، داکۆکیکاری نەهێشتنی کۆیلایەتی رەشپێستان، ئامۆژگار و داواکەری مافەکانی ئافرەت، بۆ ماوەی زیادتر لە چوار ساڵ پەرستار بوو لە شەڕی ناوخۆیی ئەمریکا و وەك پەرستار و ڕاوێژکارێك کاری کرد بۆ کۆمەڵەی ئاسوودەیی "فریدمەنز" پاش شەڕ.

لە گەڵ هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی لە ئەمریکا و بەریتانیا و فرەنسا، ئافرەتان بە پەلە خۆیان بۆ خزمەتگوزاری پەرستاری بەخشکرد. ئەم پەرستارانە لەو بارودۆخە ناخۆش و سەختەدا زۆر خۆڕاگربوون وە بەشێوەیەك بریندارانیان چارەسەر دەکرد کە پێشتر نەکرابوو. لە قەبرستانی میللی "ئارلینگتۆن" پەیکەرێك دانراوە کە "بە رۆحی پەرستاری" ناسراوە (وێنەی ٥)، ئەمە وەك ریز لێنانێك بوو بۆ ئەو پەرستارانەی کە لە لەشکری ئەمریکادا لە ماوەی شەڕی جیهانی یەکەمدا خزمەتیان کَرد. زۆربەیان لە کەرتی ٢١ نێژراون کە بە کەرتی پەرستاران ناودارە. پێشکەوتن لە بواری چاودێری تەندورستی لەکاتی شەڕی جیهانی یەکەم روویدا بەتایبەتی لە باری نەشتەرگەریدا . بۆ نموونە لە بەکارهێنانی ماددەی بێهۆشکەر، کۆنترۆڵی هەوکردن (Infection)، جۆری خوێن و ئەندامی دەستکرد دا.



وێنەی ٣: "هەریت تۆبمەن" (١٨٢٠–١٩١٣) بە مشکی خەڵکی خۆی ناسراوە چونکە لە تونێلەکانی شەمەندەفەردا کاری دەکرد. لە کاتی شەڕی ناوخۆیی (١٨٦١–١٨٦٥) پەرستاری رەشپێستە نەخۆش و بریندارەکانی دەکرد.

له شەڕی جیهانی دووەمدا کەمی چاودێر وەك مۆتەکەیەك خۆی دەرخیست.بۆ چارەسەری ئەم گرفتە گرووپی پەرستاری ئەفسەری دامەزرا. هەرچەندە لەو کاتەدا یاریدەدەرانی کاری تەندروستی زیادتر دیار و بەرچاوبوون. هەرکەسێك کە کاری چاودێری لە دەستی دەهات بەم کارە هەڵدەستا بە ڕێنمایی و سەرپەرشتی باشترین پەرستاران. لەوکاتەدا پزیشکەکان هەوڵیاندا بۆ دابین کردنی نەخۆشخانە بۆ خەواندنی نەخۆشەکان .



وێنەی ٤: "دوروتا دیکس " (١٨٠٢-١٨٨٧) بەرپرسیاری یەکێتی پەرستارانی ئافرەت لە شەڕی ناوخۆییدا.

لە کاتی شەڕی ڤیتنام ، نزیکەی ٩٠٪ لە ١١٠٠٠ ئافرەتی لەشکری ئەمریکا کە لە ڤیتنام جێگیربوون پەرستاربوون . زۆربەیان خۆبەخشانە چوون بۆ ڤیتنام پاش دەرچوونیان لە قوتابخانەی پەرستاری. بەم کارەیان بوونە گەنجترین



A





C

وێنەی ٥: A– کەرتی ٢١ لە قەبرستانی میللی "ئارلینگتۆن" ڕێزلێنان لەو پەرستارانەی کە لە لەشکری ئەمریکادا لە شەڕی جیهانی یەکەم خزمەتیان کرد. B– پەیکەری رۆحی پەرستاری لە کەرتی ٢١. C– نوسراوی سەر پەیکەردکە.

گرووپی ستافی پزیشکی له شەڕی ڤیتنام دا (دەستە یادگاری ئافرەتانی ڤیتنام ).
نزیك یادگاری کۆنە سەربازەکانی ڤیتنام پەیکەری یادگاری ئافرەتانی ڤیتنام (وێنەی ٦) دروست کراوە . ئەم پەیکەرە بۆ شانازی کردن بەو خێزانانەی کە خۆشەویستەکانی خۆیان لە کاتی شەڕ لە دەست دابوو و هەروەها بۆ ئەو ئافرەتانە دروست کراوە کە خزمەتیان کرد بۆ ئەوەی بزانرێت کە ئەو ئافرەتانە ئاسوودەیی و حەسانەوە و چاودێریان پێشکەشی برینداره‌کان کردووە و بەسۆزێکی ئینسانی دەستیان بە سەری ئەوکەسانەی کە ئازاریان هەبووە و ئەوانەی کە دەمردن کێشاوە.



وێنەی ٦ : یادگاری ئافرەتانی ڤیتنام. چوار پەیکەر بریتین لە پەرستارێك کە سەرقاڵی برینی سینگی سەربازێکە، ئەوەی‌تر تەماشای هێلیکۆپتەر دەکات بۆ یارمەتی و ئافرەتێکی تر (لە پشتەوە) بە خەمباری دانیشتووە.

# بۆچوونەکانی کۆمەڵگا

بۆچوونەکانی کۆمەڵگا سەبارەت بە پەرستاران و پەرستاری کاریگەریـەکی زۆر گرنگـی هـەبووە لـە سـەر پیشەی پەرستاری. پـێش نیـوەی سـاڵانی ۱۸۰۰، پەرستاری بێ ڕێکخستن و فێرکردن بووە و کارێکی کۆمەڵایـەتی نـەبووە . ئـەو بۆچوونەی کە ئەوکاتە زاڵ بووە ئەوە بـوو کـە جێگـای ئافرەتـان لـە ماڵدایـە و شایانی ئەوە نین کە خاوەن پیشە بـن . ڕۆڵـی ئافرەتـانی چینەکانی ناوەنـدی کۆمـەڵگا تـەنیا هاوسـەرێتی و دایکایـەتی بـوو و ئەگـەر ئـارەزووی خوێنـدنیان هەبایـە تـەنیا دەبوایـە بەمەبەسـتی بـوون بـە هاوسـەرێکی باشـتر و دایکێکـی بەرپرسیارتر بوایە . ئەو پەرستارانەی کە لەو کاتەدا لە نەخۆشخانەکان کاریان دەکرد لە رووی خوێندەوارییەوە زۆر لاواز بـوون. تەنانـەت هەنـدێکیان تاوانبـار بوون و لـە بەندیخانـەدا بەنـدکرا بـوون، بـەڵام بـۆ کـاری پەرستاری بـە کـار دەهێنران. نووسینەکانی " چاڵز دیکنز " بۆچـوونەکانی کۆمـەڵگا سـەبارەت بـە پەرستاری لەو کاتەدا دیار خستووە . لە پەرتووکەکەیدا ،"مـارتین چـۆزلویت " (۱۸۹٦) دیکنز دیدی کۆمەڵگا سەبارەت بە پەرسـتاری وەك " سـایری گامـپ" پیشان دەدات (وێنەی ۷) ، ئەو کەسە چاودێری لەنەخۆشەکان دەکرد بەڵام بە پـشت گـوێ خـستنیان، دزی کـردن لێیـان و ئـازاردانی لەشـیان. ئـەم وەسـفە ئەدەبیە کاریگەرییەکی زۆری هەبوو کە بۆچوونێکی نیگاتیڤانە لەسەر پەرستاری دروست ببێت .

بە پێچەوانەوە ، ئەندیشەی خەمخۆری و لێبوردەیی سەبارەت بە پەرستاران لە ساڵانی دوای سەدەی نۆزدەهەمدا هاتەکایەوە. ئەویش لەئەنجامی کاری "فلۆرانس نایتینگڵ" بوو لە شەڕی " کریمن " دا . پاش ئەوەی کە " نایتینگڵ" ڕێز و سەنگینی بۆ پیشەی پەرستاری هێنایە کایەوە،پەرستاران بە کەسانێکی خاوەن ڕەوشت و ڕەفتاری بەرز ،دڵۆڤان و بەسۆز، ئیماندار. لێبوردە و خۆبەخشکەر و خۆبەختکەر هاتنە بەرچاو.



وێنەی ٧: سایری گامپ ، وەسفێك لە پەرتووکی دیکنز بە ناوی مارتین چوززلویت. پیشاندەری بوچوونی نێگاتیڤانە لە پەرستاران لە سەرتای ساڵانی ١٨٠٠.

تێڕوانینێکی تر کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم سەری هەڵدا، بینینی دکتور " هاید مایدن " بوو کە ڕۆڵی کاریگەری هەبوو لە سەر دروست بوونی پەرستاران و هاوکاری کردنیان لە لایەن خەڵك و پیشەکانی تری تەندروستی.

ئەم بۆچوونە کاتێك خرایە روو کە ئافرەتان ، هێشتا لـە پێنـاو مـافی دەنگـدان هەوڵییان دەدا، پێکهاتەی خێـزان پیاوسـالارانە بـوو و ئەوکاتـەی کـە پیـشەی پزیشکی باس لە بەکار هینانی زانیاری زانستی دەکـرد، لەوکاتـەدا تـەنیا پیـاو لەمەیدان بوو .لەوکاتەوە چەندین بۆچوون سەبارەت بە پەرستاری دروست بوو. وەسفی قارەمانێتی پەرستارانی ئازا و چاونەترس لە شەڕی دووەمـی جیهـانی و بەشداریان لە هەوڵدان دژی نەخۆشی ئیفلجی منداڵان بەتایبەت دەرکـەوت کـە ئەمە دەرئەنجامی کاری پەرستارێکی ئوسترالیایی بە ناوی " ئەلیزابێت کێنێی" بوو. بینینەکانی دیکە لە ساڵانی دوای ۱۹۰۰ سەبارەت بە پەرستار بریتی بوون نە: کەسێکی خۆشەویست، شوێنگرەوەی دایـك، دایکـی بـە هێـز و شـارەزای جەستە.

لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا پیشەی پەرستاری بووە هۆی گۆڕانی دیـدی خـەڵك بـۆ پەرسـتار. لـە سـەرەتای سـاڵانی ۱۹۹۰دا، سـێ ئەنجومـەنی پەرسـتاری (کۆمەڵـەی ئـەمریکایی کۆلیـژەکانی پەرسـتاری، کۆمەڵـەی پەرسـتارانی ئـەمریکایی، رێکخـراوی ئـەمریکایی هەڵسوڕێنەرانی پەرسـتاران و یـەکێتی نەتـەوەیی پەرسـتاران) دەسـتیان کـرد بـە هـەولێکی نەتـەوەیی (بـە نـاوی پەرسـتارانی ئـەمریکا) بـۆ پێشخـستنی تێڕوانینـی خـەڵك سـەبارەت بـە پەرستاری.لەم دواییەدا " جۆنسون " و کۆمپانیای جۆنسون ۲۰ ملیـون دۆلاری تەرخان کرد لە ساڵی ۲۰۰۲ بۆ بەگەڕخستنی "کار بۆ ئایندەی پەرستاران" بـە

مەبەستی پێش بردنی پەرستاری وەك پیشەیەکی بژاردەی پۆزەتیڤانە. هەروەها قوتابخانەکانی پەرستاری و نەخۆشخانەکان هەوڵ دەدەن بۆ وەرگرتنی پەرستاری پیاو.

## رێبەرانی پەرستاری

"فلۆرانس نایتینگڵ"، "کلارا بارتون "، "لیلیەن والد"، "لاوبینا دوك"، "مارگات سانگر" و "ماری بریکینریج" ئەو رێبەرانەن کە بەشداریەکی بەرچاویان هەبووە لە مێژووی پەرستاری و مێژووی ئافرەتاندا. هەموو ئەم ئافرەتانە لە رووی سیاسیەوە پێشەنگ وپێشروی زانا و زیرەك بوون و شارەزایی ئەوان رۆڵی هەبووە لە کاریگەر بوون و رێبەرایەتی کردنی خەڵکانی تر و لە بەدیهێنانی گۆرانکاری، و تا ئێستاش وەك مۆدێل وسەرمەشق ماوون بۆ چالاکیە سیاسیەکانی پەرستاری. "ڤیرجینیا هندرسون" کە پێناسەیەکی جیهانیی نوێی بۆ پیشەی پەرستاری داهێناوە و " مارتا رۆگر" کە شیکەرەوەی تیۆری " گەشەکردن " ە نموونەی رێبەرانی هاوچەرخی پەرستارین.

### *نایتینگڵ (١٨٢٠-١٩١٠)*

بەشدارییەکانی فلۆرانس نایتینگڵ (وێنەی ٨) لە پەرستاریدا بەشێوەیکی چاك و بەرچاو تۆمار کراوە. دەستکەوتەکانی لە بەرەوپیش بردنی پێوەرەکان بۆ چاودێری کردن لە شەری "کریمن" دا وای لێکرد کە بە خاتوونی چرا ناوزەد بکرێت. هەروەها هەوڵەکانی لە چاکسازی نەخۆشخانەکان و دروست کردن و

جێبەجێ کردنی سیاسەتەکانی تەندورستی گشتی، پەرستارێکی سیاسی لێهاتوو لێ دروست بوو. یەکەم پەرستار بوو کە فشارێکی سیاسی خستە سەر حکومەت . هەروەها بەشدارییەکانی ئەم خاتوونە لە فێرکردنی پەرستاری ( لەوانەیە گەورەترین دەسکەوت ) بووەتە هۆی ئەوەی کە بە یەکەم زانا و تیوریست بناسرێت چونکە وولامی ئەم پرسیارانەی لە بارەی پەرستاری داوە: پەرستاری چیە و چی نیە؟ (١٨٦٠-١٨٦٩)



وێنەی ٨: فلۆرانس نایتینگڵ (١٨٢٠- ١٩١٠)؛ بە دانەری پەرستاری نوێی ناسراوە، کاریگەر بووە لە پێشخستنی فێرکردن، کار و بەڕێوەبردنی پەرستاری. بڵاوکراوەکەی بە ناوی تێبینیەکان سەبارەت پەرستاری: پەرستاری چیە و چی نیە؟ بۆ یەکەم جار لە بەریتانیا لە ساڵی ١٨٥٩ و لە ساڵی ١٨٦٠ لە ئەمریکا بڵاو کراوە کە بۆ هەموو ئافرەتان سەرنج ڕاکێش بوو.

نایتینگڵ لە خێزانێکی زەنگین و زیرەك و ڕووناکبیر لە دایك بوو. ئەو بڕوای بەوە هەبوو کە لە لایەن یەزدانەوە (خوا) ڕاسپێردراوە بۆ یارمەتیدانی خەڵکی تر.... و بۆ پێش بردنی سەلامەتی مرۆڤ. ئەو بوو بە پەرستار، هەرچەندە

خێزانەکەی دژی ئەوە بوون و کۆمەلگاش رێگر بوو بۆ ئەم پیشەیە بۆ ئافرەتانی دەولەتمەندی ئینگلیزی. نایتینگل وەك ئافرەتێکی گەنج کە گەشتی زۆر کردبوو، لە سالی ١٨٤٧ چاوی بە "کایزروورس " کەوت کە سێ مانگ لە خولی پەرستاری بەشداری کردبوو. لە سالی ١٨٥٣ نایتینگل لە پاریس لەگەل "خۆشکانی چاریتی " بەردەوام بوو لە سەر خوێندنی خۆی سەبارەت پەرستاری، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ بەریتانیا بۆ لە ئەستۆگرتنی سەرپەرشتیاری نەخۆشخانەی " چاریتی " بۆ خانمە نەخۆشە کاربەدەستەکان.

کاتێك نایتینگل لە شەڕی " کریمن" دا گەڕایەوە بۆ بەریتانیا، خێرخوازێکی ئینگلیزی ٤٥٠٠ لیرەی بە نایتینگل بەخشی. پاشان نایتینگل ئەم پارەیەی بۆ گەشەپێدانی قوتابخانەی نایتینگل بۆ پەرستاری بەکارهێنا کە لە سالی ١٨٦٠ دایمەزراند. ئەم قوتابخانەیە بووە بە مۆدیلێك بۆ قوتابخانەکانی تر. دەرچووانی ئەم قوتابخانانە سەفەریان دەکرد بۆ ولاتانی تر بۆ بەڕێوەبردنی نەخۆشخانەکان و پەیمانگای پرۆگرامەکانی مەشقی پەرستار.

تێروانینی نایتینگل لە پەرستاری کە بریتی بوو لە تەندروستی گشتی و رۆلی گەشەپێدانی تەندروستی پەرستاران، یەکەم شتە کە لە سەرەتایی مێژووی پەرستاری ئاماژە پێ کرایە. لەو کاتە زیاتر تیشك خرایە سەر گەشەپێدانی پەرستاری لە نەخۆشخانەکاندا.

## بارتۆن (١٨١٢-١٩١٢)

" کلارا بارتۆن " (وێنەی ٩) مامۆستایەکی قوتابخانە بوو کە خۆبەخشانە وەك پەرستار لە کاتی شەڕی ناوخۆیی ئەمریکادا کاری دەکرد. بەرپرسیاریێتی ئەو ڕێکخستنی خزمەتگوزاریەکانی پەرستاری بوو. " بارتۆن " بەوە ناودارە کە ڕۆڵی هەبووە لە دامەزراندنی ڕێکخراوی مانگی سووری ئەمریکا کە یەکی گرت لەگەڵ مانگی سووری نێودەوڵەتی کاتێك کە کۆنگرێسی وڵاتەیەکگرتووەکان پەیمانی " ژنێڤ " پەسەندکرد. ئەوە " بارتۆن " بوو کە کۆنگرێسی ڕازی کرد لە ساڵی ١٨٨٢ بۆ پەسەندکردنی ئەم پەیمانە، بۆیە مانگی سوور توانی هەوڵەکانی مرۆڤ دۆستانەی خۆی لەکاتی ئارامی ئەنجام بدات.



وێنەی ٩: کلارا بارتۆن (١٨١٢-١٩١٢)، مانگی سووری ئەمریکی ڕێك خست کە یەکی گرتەوە لە گەڵ مانگی سووری نێودەوڵەتی ئەو کاتەی کە کاتێك کە کۆنگرێسی وڵاتەیەکگرتووەکان پەیمانی " ژنێڤی " پەسەندکرد لە ساڵی ١٨٨٢.

## ریچاردز (١٨٤١-١٩٣٠)

"لیندا ریچاردز" یەکەمین پەرستاری مەشق پێکراوی ئەمریکاییە، دەرچووی نەخۆشخانەی ئینگلترای نوێی بۆ ئافرەتان و منداڵانە لە ساڵی ١٨٧٣. ریچاردز یەکەم کەس بوو کە پێشنیاری کرد پەرستار تێبینیەکانی خۆی و فەرمایشەکانی پزیشك یادداشت بکات. هەروەها دەستی پێکرد بە مەشق و راهێنانی پەرستاران و جەخت کرد لە سەر پۆشینی جل و بەرگی تایبەتی پەرستاری. هەروەها بە پێشەنگ لە بواری پەرستاری دەرونی و پیشەسازی بەناوبانگە .



وێنەی ١٠ : لیندا ریچارد (١٨٤١- ١٩٣٠) یەکەمین پەرستاری مەشق پێکراوی ئەمریکاییە.

## ماهۆنەی (١٨٤٥-١٩٢٦)

"ماری ماهۆنەی" (وێنەی ١١) یەکەم پەرستاری پسپۆری ئەفریقیایی- ئەمریکایی بوو. لە نەخۆشخانەی ئینگلترای نوێی بۆ ئافرەتان و منداڵان لەساڵی ١٨٧٩دەرچووە، بە بەردەوامی بۆ وەرگرتنی ئەفریقیەکانی ئەمریکایی لە

پەرستاری و هەبوونی دەرفەتی یەکسانی بۆ هەمموان هەوڵی دەدا . کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکا هەردوو ساڵ جارێك ماری ماهۆنەیان خەڵات دەکرد لە بەرئەوەی کە بەشدارییەکی بەرچاوی هەبوو لە پەیوەندیەکانی نێوان نەژادەکان.



وێنەی ١١ : ماری ماهۆنەی (١٨٤٥-١٩٢٦) " یەکەم پەرستاری مەشقپێکراوی ئەفریقیایی-ئەمریکایی بوو.

## واڵد (١٨٦٧-١٩٤٠)

"لیلیەن واڵد" (وێنەی ١٢) بایەخ پێدراوە وەك دامەزرێنەری پەرستاری تەندورستی گشتی (Public Health Nursing )."واڵد" و"ماری برۆستر" یەکەم کەس بوونە بۆ پێشکەش کردنی مەشق کردنی خزمەتگوزاری پەرستاری

لە گەڕەکە هەژارەکانی نیویۆرك. خانوویان لە نهۆمی دووەمی بینایەکدا بوو کە بەکرێ گیرابوو بە ناوی " هنری ستریت ستلمنت " و "کارگوزاری عیادەی پەرستاری" کە خزمەتگوزاری پەرستاری، خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و چالاکیەکانی ڕێك و پێکی فێرکردن و کەلتووری پێشکەش دەکرد . بە ماودیەکی زۆر کەم پاش ئەوە قوتابخانەیەکی پەرستاری لە نزیك ئەم شوێنە دامەزرا .



وێنەی ١٢ : لیلیەن والد (١٨٦٧-١٩٤٠) دانەری " هنری ستریت ستلمنت " و "کارگوزاری عیادەی پەرستار" کە خزمەتگوزاری پەرستاری، خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی وە چالاکیەکانی ڕێك و پێکی فێرکردن و کەلتووری پێشکەش دەکرد و بە دامەزرێنەری پەرستاری تەندورستی گشتی ناسراوە.

## دۆك (١٨٥٨-١٩٥٦)

لاوینیال دۆك (وێنەی ١٣) ، ئافرەتێك بوو کە بۆ یەکسانی مافی ژن و پیاو هەوڵی دەدا .نووسەرێکی زۆر بە بەرهەم ، چالاککارێکی سیاسی ، داواکەری

مافی دەنگدانی ژن و هاوڕێی " واڵد " بوو . ئەو لە چالاکیەکانی نارەزایی دەربڕین لەسەر مافەکانی ئافرەت کاری کردووە و دەرئەنجامیشی ئەوەبوو کەلە ساڵی ۱۹۲۰ دا لە نۆزدەهەمین گۆڕانکاری لە یاسای بنەرەتی ئەمریکا ئافرەتان مافی دەنگدانیان بە دەست هێنا. هەروەها هێرشێکی ڕێکخست بۆ دانانی یاسایەك کە ڕێگە بدات بە پەرستاران بۆ کۆنترۆل کردنی پیشەکەیان. لە ساڵی ۱۸۹۳دا، دۆك بە یارمەتی " ئارلاید نۆیتنگ " و " ئیزابل هامپتۆن رۆب " کۆمەڵەی ئەمریکایی سەرپەرشتیارانی قوتابخانەکانی مەشقی بۆ پەرستارانی وڵاتە یەکگرتووەکان و کانادای دامەزراند کە بووە بناغە بۆ یەکێتی نەتەوەیی پەرستاری ئێستا .



وێنەی ۱۳ : ڕابەری پەرستاری و داواکەری مافی دەنگدانی ئافرەت لاڤینیا دۆك (۱۸۵۸-۱۹۲۵) لە چالاکیەکانی نارەزایی دەربڕین لەسەر مافەکانی ئافرەت چالاك بوو. و دەرئەنجامیشی ئەوەبوو کەلە ساڵی ۱۹۲۰ دا لە نۆزدەهەمین گۆڕانکاری لە یاسای بنەرەتی ئەمریکا ئافرەتان مافی دەنگدانیان بە دەست هێنا.

## سانگر(۱۸۷۹-۱۹٦٦)

"مارگاریت هیگینز سانگر" (وێنەی ١٤) پەرستاری تەندورستی گشتی لە نیویۆرك لە هەموان کاریگەرتر بوو لە بواری چاودێری تەندورستی ئافرەتان . وەك دامەزرێنەری پرۆگرامی رێکخستنی خێزان (planned parenthood ) بەهۆی کردنەوەی یەکەمین کلینیکی زانیاری کۆنترۆڵی منداڵبوون لە ئەمریکا ناسراوە . ئەزموونەکانی ئەم خاتوونە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری زگپڕی خۆنەویستانە لە ناو هەژاراندا هۆیەك بوو بۆ دیارکردنی ئەم گرفتە.



وێنەی ١٤: پەرستاری چاڵاك مارگاریت سانگر ناسراوە بە دانەری پرۆگرامی رێکخستنی خێزان بەهۆی کردنەوەی یەکەمین کلینیکی زانیاری کۆنترۆڵی منداڵبوون لە ئەمریکا لە ساڵی ١٩١٦.

## برێکینریج (۱۸۸۱ -۱۹٦٥)

پاش شەڕی جیهانی یەکەم ، "ماری برێکینریج" (وێنەی ١٥) کە پەرستارێکی رابەر و پێشەنگی بەرچاوە، خزمەتگوزاری پەرستاری سەرسنووری (Frontier

Nursing Service) دامەزراند. لە ساڵی ١٩١٨دا، لەگەڵ کۆمیتەی ئەمریکی بۆ فەرەنسای کاولکراو بۆ دابەش کردنی خۆراك ،جل وبەرگ و شت ومەکی پێویست بۆ گوندەکان و چاودێری لە منداڵانی نەخۆش کاری کرد. لە ساڵی ١٩٢١ "بریکینریج " گەڕایەوە بۆ ئەمریکا بۆ پلاندانان بۆ ئامادەکردنی چاودێری تەندورستی بۆ خەڵکی گوندەکانی ئەمریکا . لەساڵی ١٩٢٥" بریکینریج " و دوو هاوڕێ پەرستارەکەی دەستیان بە خزمەتگوزاری پەرستاری کرد لە " لیسلی کۆنتی " و" کنتاکی " . لەگەڵ ئەم ڕێکخراوە " بریکینریج " هەروەها یەکەمین قوتابخانەی مەشقی مامانی لە وڵاتە یەکگرتوەکان دامەزراند.



وێنەی ١٥ : "ماری بریکینریج" پەرستارێك کە کاری مامانی لە بریتانیا، ئۆستراليا و نیوزیلەندا ئەنجامداوە دانەری خزمەتگوزاری پەرستاری سەرسنوورە لە کنتاکی لە ساڵی ١٩٢٥ بۆ پێشکەش کردنی چاودێری تەندروستی سەرەتایی خێزانەیی لە گوندەکان.

# کاری پەرستاری سەردەم

بۆ تێگەیشتن لەکاری پەرستاری سەردەم دەبێت تەماشای پێناسەکانی پەرستاری، سوودمەندانی پەرستاری، بواری پەرستاری، شوێنەکانی کاری پەرستاری، رۆڵ و ئەرکەکانی پەرستار و پێوەرەکانی ئێستای کاری پەرستاری کلینیکی بکەین .

## پێناسەکانی پەرستاری

فلۆرانس نایتینگڵ نزیکەی ١٥٠سال پێش پەرستاری بەم شێوە پێناسە کردووە: *کاری بەکارهێنان یان سوودوەرگرتن لە ژینگەی نەخۆش بۆ یارمەتیدانی بۆ چاك بوونەوەی.* نایتینگڵ جەختی کردە سەر پاك وخاوینی . هەوای خاوێن وگۆرینی و دەستەبەر کردنی هێمنی و ئارامی بو چاك بوونەوەی نەخۆش. زۆرجار بە یەکەم پەرستاری تیوریست دەناسرێت . نایتینگڵ ئاستی پەرستاری بەرزکردەوە لە رێگای فێرکردن . پەرستاران خەڵکیان فێردەکرد چۆن چاودێری لە نەخۆش بکەن . " ڤیرجیتینا هندرسون " یەکەم پەرستاری نوی بوو کە پەرستاریی پێناسە کرد بەم شێوەیە: *تاکە ئیشی پەرستار یارمەتیدانی کەسە ، چ نەخۆش یان ساخ ، ئەنجامدانی ئەوکارانەی کە پیویستن بو تەندورستی یان چاك بوونەوەی (یان بۆ مەرگێکی ئارام )، ئەگەر کەسەکە*

*تواناى ئەنجام دانى هەبێت و ئەگەر نا يارمەتى دەدات بۆ بەدەست هێنانى سەربەخۆيى لە ئەنجامدانى ئەم كارانە.* هندرسون وەك نايتينگڵ پەرستارى وەسفى كردووە بەپەيوەندى لەگەڵ نەخۆش و ژينگەى نەخۆش. بەڵام بە پێچەوانەى نايتينگڵ، هندرسۆن تەنيا ئاماژەى بەنەخۆش نەداوە بەڵكو ئەوانەى كە سەلامەتيشن و ئاماژە بە رۆڵى فێركردن و پێشتگيرى كردنى پەرستار دەدات دواى چاكبونەوەى نەخۆش. لە نيوەى دواى سەدەى بيستەمدا ژمارەيەك لە پەرستارانى هزرمەند ، بيردۆزەكانى خۆيان سەبارەت بە پێناسەكردنى پەرستارى، پەرەپێدا. ئەم پێناسە بيردۆزيانە گرنگن چونكە پێناسەيەكى قوولترى پەرستارى دەكەن لە بەرامبەر پێناسەكانى سادە و سەرەتاييەكاندا، ئەمانە شيدەكەنەوە كە پەرستارى چيە و پەيوەندى نێوان پەرستاران، پەرستارى، نەخۆش و ژينگەكەى و مەبەستى دوايى بۆ نەخۆش واتە تەندورستى چۆنە . هەندێك بابەت لە زۆربەى پێناسەكان بەم شێوەيەن:

- پەرستارى چاودێرى كردنە .
- پەرستارى هونەرە .
- پەرستارى زانستە .
- نەخۆش چەقى كارى پەرستارييە .
- پەرستارى هەمەلايەنەيە .
- پەرستارى خۆگونجاندنە .

* پەرستاری تیشك دەخاتە سەر پێشوەچوونی تەندورستی ،ڕاگرتنی تەندورستی و گەڕاندنەوەی تەندروستی .
* پەرستاری پیشەی یارمەتیدانە .

کۆمەڵەکانی پیشەی پەرستاری، پەرستاریان تاقی کردووتەوە وە پەردەیان بە پێناسەکان داوە . لە ساڵی ١٩٧٣دا کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکا کاری پەرستاریان بەم جۆرە وەسف کرد: *ڕاستەوخۆ، ئامانجدار و گونجاوە لەگەڵ پێویستیەکانی تاکەکەس، خێزانە و کۆمەڵگا لەکاتی تەندروستی و نەخۆشیدا* . لەساڵی ١٩٨٠دا ، ئەم کۆمەڵەیە پێناسەی خۆی بۆ پەرستاری بەم شێوەیە گۆری: *پەرستاری دەست نیشان کردن و چارە سەرکردنی کاردانەوەی مرۆڤە بە گرفتەکانی شاراوە و ڕاستەقینەی تەندروستی*. لە ساڵی ١٩٩٥دا ئەم کۆمەڵەیە دانی بەوە ناوە کە زانستی چاودێری کردن کاریگەر و بەشدارە لە فەلسفە و کاری پەرستاریدا. پێناسەکانی نوێی ئەم کۆمەڵەیە زۆر فراوانترە: *پەرستاری ڕاگرتن و پێشخستن و گەورەترین سوود لێ وەرگرتنە لە سەلامەتی و تواناکان، پاراستنە لە نەخۆشی وئازار و برین، سووك کردنی ڕەنج و ئازارە لەڕێگای دەست نیشانکردن و چارەسەرکردنی کاردانەوەکانی مرۆڤ. و پێشتگیری کردن و چاودێری کردنە لە تاکەکەسان، خێزانەکان ، کۆمەڵگاکان و کۆمەڵەکان .*

تویژینەوە بۆ دۆزینەوەی واتای چاودێری کردن لە پیشەی پەرستاریدا زۆربووە . بۆ نموونە " کۆفمەن " (٢٠٠٤)، تویژینەوەیەکی چۆنایەتی سەبارەت وەسف کردنی چاودێری کەلتووری لە کاری پەرستاریدا ئەنجام داوە .هەر بەم شێوە " گرِبر و میتچەم" (٢٠٠٤) تویژینەوەیان ئەنجامدا بۆ دیار کردنی ئەو کردارە و دەست تێوەردان و پەیوەندیانەی نێوان خەڵك کە کاری چاودێری و هاوسۆزی روون دەکاتەوە .

## سوودمەندانی پەرستاری

سودمەندانی پەرستاری هەندێك جار بە بەکارهینەر (Consumer)، هەندێك جار بە نەخۆش (Patient) وە هەندێك جار بە تەندروستخواز(Client) ناو دەبردرێن. بەکارهێنەر کەس یان کۆمەڵە خەڵك و یا خود کۆمەلگایەکە کە خزمەتگوزاری یان کەرستەی تەندروستی بەکار دەهێنن. ئەو کەسانەی کە بەرهەمەکانی چاودێری یان خزمەتگوزاری تەندروستی بەکاردەهێنن، بەکارهێنەرەکانی چاودێری تەندروستین . نەخۆش ئەو کەسەیە کە چاوەرێ یان رازی دەبێت بۆ چارەسەری پزیشکی و چاودێری کردن. Patient وشەیەکی لاتینیە بەمانای ئازارکێش یان منداڵبوون . بەپێی نەریتی کۆن، ئەو کەسەی چاودێری تەندروستی وەردەگرێت نەخۆشی ناونراوە . بە زۆری، ئەوکاتەی کە خەڵك داوای یارمەتی دەکەن بە هۆی نەخۆشی یان بۆ نەشتەرگەری بە نەخۆش دادەنرێن. هەندێك پەرستار پێیان وایە کە وشەی

نەخۆش مانای پەسەندکردنی ملکەجی بڕیارەکان و چاودێری پیشەکانی تەندروستی دەبەخشێت. هەروەها وێڕای جەخت کردن لە سەر پێشخستنی تەندروستی و پێشگیری کردن لە نەخۆشی ، زۆربەی سوودمەندانی پەرستاری نەخۆش نین . سەرەڕای ئەوەش، پەرستاران هەلسوکەوتیان لەگەڵ ئەندامانی خێزانە و ئەوکەسانەی کە پاڵپشتی و زانیاری و ئاسوودەیی بۆ نەخۆش دابین دەکەن . بەم هۆیانە، پەرستاران زیادتر لە جاران سوودمەندانی چاودێری تەندروستی بە تەندروستخواز ناو دەبەن . تەندروستخواز ئەو کەسەیە کە سەرقاڵ دەبێت بە ئامۆژگاری و خزمەتگوزاری وەرگرتن لە خەڵکانی تر کە شارەزان لە پێشکەش کردنی ئەم خزمەتگوزاریانە . وشەی تەندروستخواز ئەو سوودمەندانەی چاودێری تەندروستی دەگرێتەوە کە هاوکار و بەشدارن لە چاودێری کردن و بەرپرسن لە تەندروستی خۆیان . بەم شێوەیە باری تەندروستی و هاوکاری کردن لەگەڵ پیشەکانی تەندروستی بەرپرسیارێتی خودی تەندروستخوازە.

## بواری پەرستاری

پەرستاران خزمەتگوزاری خۆیان پێشکەش سێ جۆرە تەندروستخواز دەکەن: تاکەکەس، خێزانە و کۆمەڵەکان. کاری پەرستاری چوار بوار بەخۆوە دەگرێت: پێشخستنی تەندروستی و لەشساغی، رێگەگرتن و خۆپاراستن لە نەخۆشی، گەڕاندنەوەی تەندروستی و چاودێری کردن هەتا سەرەمەرگ.

### *پێشخستنی تەندروستی و لەشساغی*

لەشساغی پرۆسەی تێکەڵ بوونە بەو چالاکی و رەفتارانەی کە ئاستی چۆنیەتی ژیان و توانا شاراوەکانی مرۆڤ تا بەرزترین پلە زیاد دەکات .پەرستاران دەبنە هۆی پێشخستنی لەشساغی تەندروستخواز بۆ هەر کەسێك جا چ نەخۆش بێت یان تەندروست . شێوەی ژیان وەك پێشخستنی خۆراك و توانای جەستەیی، خۆپاراستن لە هەڵە بەکارهێنانی دەرمان و ئەلکحول ، کەم کردنەوەی جگەرە کێشان و رێگەگرتن لە رووداو و ئازار و برینداربوون لە ماڵ وشوێنی کارکردن .

### *رێگەگرتن و خۆپاراستن لە نەخۆشی*

ئامانج لە بەرنامەی خۆپاراستن لە نەخۆشی، راگرتنی باشترین ئاستی سەلامەتیە بە رێگەگرتن لە نەخۆشی. چالاکیەکانی پەرستاری کە رێگە لە نەخۆشی دەگرن بریتین لە: ڤاکسینە کردن، چاودێری کاتی زگپڕی و شیرخۆری و خۆپاراستن لەو نەخۆشیانەی کە بەرێگای سێکس دەگوازرێنەوە (STD).

### *گەڕاندنەوەی تەندروستی*

مەبەست لە گەڕاندنەوەی تەندروستی زوو دۆزینەوەی نەخۆشیە و تا دەگاتە یارمەتیدانی تەندرۆستخواز لە کاتی چاکبوونەوەدا. چالاکیەکانی پەرستاری بریتین لە :

* پێشکەشکردنی چاودێری راستەوخۆ لە نەخۆش ، وەك پێدانی دەرمان،حەمام کردن و چارەسەر کردن و کردارە تایبەتیەکانی پزیشکی .

* ئەنجامدانی کردارەکانی دەست نیشان کردن و هەڵسەنگاندن وەك گرتنی فشاری خوێن و تاقی کردنەوەی پیسایی بۆ خوێنی شاراوە .

*راوێژ کردن لە گەڵ پیشەکانی تری چاودێری تەندروستی سەبارەت گیروگرفتەکانی نەخۆش.

* فێرکردنی تەندروستخواز سەبارەت بە چالاکیەکانی چاك بوونەوە وەك وەرزش کە پرۆسەی چاك بوونەوە خێراتر دەکات .

* گەڕاندنەوەی تەندروستخواز بۆ باشترین ئاستی کار، دووای نەخۆشی عەقلی و فیزیکی ( جەستەیی ) ، زامدار بوون یان خووکردن بە ماددەکانی کیمیاوی .

***چاودێری کردن تا مردن***

ئەم بوارەی پەرستاری ئاسوودەکردن و بایەخدانە بەو کەسانەی کە لە سەرەمەرگدان لە هەر تەمەنێکدا بن. بریتیە لە یارمەتیدانی تەندروستخواز کە تا زیندووە ئاسوودە بێت لە ئێش وئازار تاکو دەمرێت و یارمەتیان دەدات بۆ سازگاریان لەگەڵ مردندا . پەرستاران ئەم چالاکیانە لە ماڵ یان نەخۆشخانە یان ئەو شوێنانەی کە ئاسانکاری تێدایە ، ئەنجام دەدەن . هەندێك کۆمپانیا یان بریکار کە بە ئاسایشگاە یان خانووی رێبوارن و هەژاران و نەخۆشان ناو دەبردرێن (Hospices) بۆ ئەم مەبەستە کاردەکەن .

# شوێنەکانی کاری پەرستاری

لە ڕابردوودا، نەخۆشخانەکان کە چاودێری ڕاستەقینەیان پێشکەش دەکرد شوێنی سەرەکی ئیش کردنی زۆربەی پەرستاران بوون. ئەمڕۆ زۆربەی پەرستاران لە نەخۆشخانە ئیش دەکەن بەڵام ڕۆژ بەڕۆژ ڕێژەی ئەو پەرستارانەی کە لە ماڵان، بریکارەکانی کۆمەڵگا، کلینیکی گەڕۆك، ئەو شوێنانەی کە ئاسانکاری چاودێری درێژخایەن تێدایە ،و ڕێکخراوەکانی ڕاگرتنی تەندروستی (Health maintenance organization) و سەنتەرکانی پەرستاری ئیش دەکەن زیاد تر دەبێت (وێنەی ١٦) .

لە شوێنە جیاوازەکان، پەرستاران ئاستی جیاوازیان هەیە لە سەربەخۆیی و بەرپرسیاریتی . ئەوان لەوانەیە چاودێری ڕاستەوخۆ پێشکەش بکەن، نەخۆش فێربکەن یان پاڵپشتی بکەن ، خزمەت بکەن وەك ماف پەروەریك یان ببنە هۆکاری گۆڕانکاری و یارمەتی دیارخستنی ئەو سیاسەتە تەندروستیانە بدەن کە کاریگەرن لەسەر تەندروستخوازان لە نێو کۆمەڵگا و نەخۆشخانەکاندا.

# ئەرکەکانی کاری پەرستاری

ئەرکەکانی کاری پەرستاری، یان ئیشەکانی یاسایی کاری پیشەیی پەرستاری، کاری پەرستاری لە وڵاتە یەکگرتووەکان و کەنەدا ڕێك دەخات . هەر ویلایەتێك لە وڵاتەیەکگرتووەکان وە هەر ناوچەیەك لە کەنەدا ئەرکەکانی خۆی هەیە. هەرچەندە ئەرکەکان جیاوازن بەڵام ئامانج لە هەموویان یەك شتە، ئەویش پاراستنی تەندروستی خەڵکە . پەرستاران بەرپرسی زانینی ئەرکەکانی ناوچەی خۆیانن .











وێنەی ١٦: کاری پەرستاری لە شوێنە جیاوازەکان. وێنەکان وەك سووڕانی میلی کاتژمێر لە سەرەوە: پەرستاری لە ژووری نەشتەرگەری، پەرستاری منداڵان، پەرستاری کۆمەڵ، پەرستاری لە بە ساڵاچووان، پەرستاری لە ماڵان.

# پێوەرەکانی کاری پەرستاری

دامەزراندن و ئەنجامدانی پێوەرەکانی کارکردن گەورەترین ئەرکی ڕێکخراوی پیشەییە . ئامانج لە پێوەرەکانی کاری کۆمەڵەی پەرستاری ئەمریکا، وەسفکردنی ئەو بەرپرسیارەتیانەیە کە لە سەرشانی پەرستارانن . کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکا بە سوود وەرگرتن لە پرۆسەی پەرستاری وەك بناغەیەك ئاستی پێوەرە گەشتیەکانی پەرستاری پەرە پێداوە. ڕێکخراوەکانی پەرستاری تایبەت، پێوەرەکانی تایبەت بە بەشی پسپۆری خۆیان داناوە . بۆ پەرستاران لە کەنەدا هەر ناوچەیەك یان هەرێمێك پێوەری کاری تایبەت بە خۆیان دارِشتووە . پێوەرەکانی پیشەیی کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکا ئەو رەفتارانە وەسف دەکات کە لە رۆڵی پیشەیی پەرستاری چاوەڕێ دەکرێت (خشتەی١).

| خشتەی١- پێوەرەکانی کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکا |
|---|
| پێوەرەکانی کار بۆ پەرستاری باوەرپێکراو بە سوود وەرگرتن لە پروسەی پەرستاری ئاستێکی شایستە لە چاودێری پەرستاری وەسف دەکات.<br>١- هەڵسەنگاندنی سەرەتایی<br>کۆکردنەوەی گشتگیری زانیاریەکان سەبارەت بە تەندروستی نەخۆش یان بارودۆخێك.<br>٢- دەستنیشان کردن<br>شیکردنەوەی زانیاریەکانە کە لە هەڵسەنگاندنی سەرەتایی کۆکراوەتەوە بۆ دیارکردنی گیروگرفتەکان .<br>٣- دیار کردنی ئامانج<br>ئەو ئامانجانەی کە پاش چارەسەری چاوەڕێ دەکرێت .<br>٤- پلان دانان<br>دارشتنی پلانێك کە ستراتیجیەکان و چارەکان نیشان بدات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان.<br>٥- جێ بەجێ کردن<br>ئەنجام دانی ئەو پلانەی کە دارێژراوە.<br>ا - یەکخستنی چاودێریەکان |

ب – ئامۆژگاری تەندروستی و پێشخستنی

پ– راوێژ کردن

پەرستاری بڕواپێکراوی پێشکەوتوو و پەرستارە تایبەتەکان وەك راوێژکارێکن کە کاریگەریان هەیە لەسەر دانانی پلان و زیادکردنی تواناکانی خەڵکی تر و ئەنجامدانی گۆڕانکاری .

ت – سەربەخۆیی و چارەسەرکردنی دیاریکراو

پەرستاری بڕوا پێکراوی پێشکەوتوو بە سەربەخۆیی دیاری کراوی دەسەڵاتەکانی خۆی بە کاردەهێنێت .وە لەسەر بنەمای یاسای فیدراڵ یا هەرێمەکەی خۆی کار دەکات لە هەڵبژاردنی شێوازی کارکردن و ناردنی نەخوش بۆ جێگای تر و چارەسەرکردنی .

س– چارەسەرکردن و هەڵسەنگاندن.

٦– هەڵسەنگاندنی دوایی

هەڵسەنگاندنی پێشوەچوون بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان .

٧–.چۆنیەتی کارکردن

پێشکەوتنی ئاستی چۆنێتی بەرێك و پێکی و سوودبەخش بوونی کاری پەرستاری

٨– فێرکردن

بەدەست هێنانی زانیاری و شایستەیی کە رەنگدانەوەی کاری پەرستاری ئێستا بێت.

٩– هەڵسەنگاندنی کاری پیشەیی

هەڵسەنگاندنی کاری خودی پەرستار بە پێوەرەکانی کاری پیشەیی و رێنماییەکان ، یاساکانی پەیوەندار ، دەستوور و رێسا و پەیڕەوەکان.

١٠– ئاکادیمی بوون

تێکەڵاو بوون و هاوکار بوون لەگەڵ ئەو هاورێ و گروپانەی کە بۆ پێشخستنی پیشەکە ئیش دەکەن .

١١– هاوکاری کردن

هاوکاری کردن لەگەڵ نەخۆش و خێزانە ، وە خەڵکانی تر لە بەرێوەبردنی کاری پەرستاریدا .

١٢– رەوشت

بەرچاوگرتنی لایەنی رەوشت بەرزی لە هەموو لایەنی کاردا .

١٣– توێژینەوە

بەکارهێنانی ئەنجامی توێژینەوەکان لە کاردا .

١٤– بەکارهێنانی سامانەکان

رەچاوکردنی ئەو فاکتەرانەی کە پەیوەندیان هەیە بە مەترسیدار نەبوون و ئاسوودەیی، سوودمەندبوون، نرخی تێچوون، و کاریگەریان لە سەر کار لە کاتی پلان دانان و جێ بەجێ کردنی خزمەتگوزاری پەرستاری .

١٥– رێبەرایەتی: رابەربوون لە شوێنی کاری پیشەیی و خودی پیشەکە .

# ڕۆڵ و ئەرکەکانی پەرستار

پەرستاران ژمارە ڕۆڵێك لە ئەستۆ دەگرن کاتێك کە چاودێری پێشکەش دەکەن بۆ تەندروستخواز . پەرستاران زۆرجار ڕۆڵەکانی خۆیان پێکەوە و لەیەك کاتدا بەجێ دەگەیەنن نەك بەتەنیا . بۆ نموونە پەرستار لەوانەیە وەك ڕاوێژکارێك ئیش بکات لە کاتی چاودێری و بایەخدان بە جەستە و فێرکردنی لایەنەکانی ئەم بایەخدانە . ئەو ڕۆڵانەی کە لە کاتێکی تایبەت پێویستن بە گوێرەی پێویستی نەخۆش و بارودۆخی دەوروبەرەکەی دەگۆڕدرێت.

## چاودێر

ڕۆڵی چاودێری ، هەر لە کۆنەوە بریتی بووە لەو چالاکیانەی کە لە رووی جەستەیی و دەروونیەوە یارمەتیدەری تەندروستخواز بوون و لە هەمان کاتدا پاراستی ڕێز و بەهای نەخۆش . کارەکانی پێویستی پەرستاری لەوانەیە بریتی بن لە چاودێری کردن تەواوی لەو تەندروستخوازەی کە لە هەموو ڕوویەکەوە پشتی بەستووە بە پەرستاری یان چاودێری کردنی نیمچەیی بۆ ئەو تەندروستخوازانەی کە لە هەندێك ڕووەوە پشت دەبەستن بە پەرستار و چاودێری کردنی، وێڕای پاڵپشتی و ئامۆژگاری کردن بۆ یارمەتیدانی نەخۆشەکان بۆ گەیشتن بە بەرزترین ئاستی تەندروستی و سەلامەتی .

چاودێری کردن لایەنــەکانی جەســتەیی، دەروونــی، گەشــەیی ، کــەلتووری و ڕۆحی لەخۆوە دەگرێت . پرۆسەی پەرستاری بۆ چـاودێری کردنــی پەرسـتاری چوارچێوەیەك دادەنێت. پەرستار یا بە خۆی کاری چاودێری ئەنجام دەدات و یاخود بە پەرستارێکی تری دەسپێرێت .

## پەیوەندکار

پەیوەندی بەشی جیانەکراوەی هەموو ڕۆڵەکانی پەرستارە. پەرستاران پەیوەندی دەکــەن بــە تەندروسـتخواز، کەسـانی پاڵپشتکەر، خـاوەن پیـشەکانی دیکـەی تەندروستی و خەڵك لە کۆمەڵگادا .

لــە ڕۆڵــی پەیوەندیکاریــدا، پەرســتاران گیروگرفتــەکانی تەندروسـتخواز دیــاری دەکەن و یان بە قسە یان بە نووسین پەیوەندی دەکـەن بـە ئەنـدامانی دیکـەی تیمی تەندروستی. چۆنیەتی پەیوەندی کردنی پەرستار فاکتــەرێکی گرنگـە لـە چــاودێری پەرســتاری . پەرســتار دەبێــت توانــای پەیوەنــدی کردنــی ڕوون و دروستی هەبێت بۆ بەدەسـت هێنانی تەندروستی تەندروستخواز .

## فێرکەر (ماموستا)

پەرستار وەك فێرکەرێك یارمەتی تەندروسـتخواز دەدات بـۆ فێربـوونی چـۆنێتی پاراستنی و بــە دەسـتهێنانەوەی تەندروسـتی خـۆی. پەرسـتار پێداویـستیەکانی فێربــوونی تەندروسـتخواز هەڵدەســەنگێنێت و ئامــادەی دەکــات بــۆ فێربــوون ، ئامانجـــە تایبەتیـــەکانی فێربـــوون دیـــاری دەکـــات کـــە پەیودســـتن بـــە

تەندروستخوازەوە، ستراتیژەکانی فێرکردن بەکار دێنێت و ئاستی فێربوونەکەی دەپێوێت. پەرستاران هەروەها ئامۆژگاری ئەو کەسانە دەکەن کە لەگەڵیدا کاردەکەن (بەڵام پەرستار نین ) وەك بەردەست .

## پارێزەر

پارێزەری بۆ پاراستنی تەندروستخوازە . لەم رۆڵەدا پەرستار پێداویستی و ئارەزووەکانی تەندروستخواز روون دەکاتەوە بۆ پیشەکانی دیکەی تەندروستی، وەك ئاگادار کردنی پزیشك لە ویستەکانی نەخۆش. هەروەها یارمەتی روونکردنەوەی مافەکانی نەخۆش دەدات و هاوکاریان دەکات بۆ بەرگریکردن لە مافەکانیان.

## راوێژکار

راوێژکاری پرۆسەی یارمەتیدانی نەخۆشە بۆ ناسین و سازگاربوون لەگەڵ گیروگرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکان، بۆ گەشەکردنی پەیوەندیەکانی نێوانیان و پێشخستنی گەشەی تاك. هەروەها پێشکەش کردنی پاڵپشتی تایبەت بە هەست و سۆز، رۆشنبیری و دەروونی. پەرستار لە سەرەتادا راوێژ دەکات لەگەڵ ئەو کەسە تەندروستەی کە گرفتی گونجاوی نۆرماڵی هەیە و یارمەتی کەسەکە دەدات کە بووچون و هەست و رەفتاری نوێی هەبێت لە رێگای هاندانی تەندروستخواز بۆ گرتنەبەری رێگەچارەی‌تر ناسینی جۆرە رەفتاری دیکە و پەرەپێدانی هەستی زاڵبوون بە سەر خۆدا .

## بەدیهێنەری گۆڕانکاری (change agent )

پەرستار کار دەکات وەك بەدیهێنەری گۆڕانکاری، کاتێك یارمەتی تەندروستخواز دەدات بۆ گۆڕینی رەفتارەکانی . ئەو کاتەی کە سیستەم توانای یارمەتیدانی تەندروستخوازی نییە بۆ بەدەستهێنانی تەندروستیەکەی. پەرستار کار دەکات بۆ بەدیهێنانی گۆڕانکاری لە سیستەمەکەدا. گۆڕانی تەکنولۆژیکی، تەمەندرێژی مرۆڤەکان لە سایەی خزمەتگوزاری تەندروستی و گۆڕانی دەرمانەکان نموونەیەکی ئەو بابەتانەن کە پەرستاران پێیانەوە سەرقاڵن.

## رابەر یان پێشڕەو

رابەر کار دەکاتە سەر تاکەکان بۆ پێکەوە کارکردنیان بە مەبەستی ئامانجێکی تایبەت. رابەر لە چەند ئاستی جیاوازدا رۆڵ دەگێڕێت: کەس، خێزان، گروپێك لە تەندروستخوازان یان کۆمەڵگاکان. رابەرایەتی کاریگەر پرۆسەیەکی زانایانەیە، پێویستی بە تێگەیشتن لە پێداویستی و ئامانجەکانە بۆ هاندانی خەڵك، هەروەها پێویستی بە زانیاریە لەبارەی بەکارهێنانی شێوازەکانی کارامەیی رێبەرایەتی و پەیوەندی نێوان کەسان بۆ کاریگەر بوون لە سەر خەڵك.

## بەڕێوەبەر

پەرستار چاودێری پەرستاری تاکەکەس ، خێزانە و کۆمەڵگاکان دەکات. پەرستاری بەرێوەبەر چالاکیە پەرستاریەکان دەسپێرێتە کارمەندانی

ژێردەسەڵاتی خۆی و سەرپەرشتیان دەکات و کارەکانیان هەڵدەسەنگێنێت. بەڕێوەبردن پێویستی بە زانیاری هەیە سەبارەت بە پێکهاتە و جووڵەی ڕێکخراوەیی ،دەسەڵات و لێپرسراوێتی، ڕابەرایەتی، تیوری گۆڕانکاری، پارێزەری، ڕاسپاردن و سەرپەرشتی کردن و هەڵسەنگاندن.

## چارەسەرکەری گرفت (Case Manager)

پەرستاری چارەسەرکەری گرفت لە گەڵ تیمی چاودێری تەندروستی کار دەکات بۆ پێوانەکردنی کاریگەری پلانێك کە بۆ چارەسەری گرفتێك دانراوە و چاودێری ئاکامەکانی. هەر دەزگایەك یان بنکەیەك ڕۆڵی پەرستاری چارەسەرکەری گرفت دیاری دەکات . لە هەندێك دام و دەزگادا، چارەسەرکەری گرفت لەگەڵ پەرستارانی ستافدا کار دەکات بۆ سەرپەرشتی کردنی چاودێرییەکی تایبەت. لە هەندێکی تردا ؛ چارەسەرکەری گرفت پەرستارێکی سەرەتاییە یان ئاستێك لە چاودێری ڕاستەوخۆ پێشکەش دەکات بۆ تەندروستخواز و خێزانەکەی . هەروەها کۆمپانیاکانی بیمە هەندێك ڕۆڵیان بۆ چارەسەرکەری گرفت دیاری کردووە و بەرپرسیارەتیەکان لەوانەیە جیاواز بن لە نەخۆشخانەکانی چارەسەری حاڵەتی توندوتیژی (acute) بگرە تا ئەو شوێنانەی کە نەخۆشەکان بە نرخێکی زۆر چارەسەر دەکرێن .

## بەکارهێنەری توێژینەوە

پەرستاران زۆربەی جاران، توێژینەوە بەکاردەهێنن بۆ پێشخستنی چاودێری لە تەندروستخواز. لە کاری کلینیکی دا پەرستاران پێویستیان بەم شتانە هەیە :
أ- هەندێك زانیاری سەبارەت بە پرۆسە و زمانی توێژینەوە ب- هەستیاربوون بەرامبەر بەو بابەتانەی کە پەیوەستن بە پاراستنی مافەکانی مرۆڤ، ج- بەشداری کردن لە دیار کردنی ئەو گیروگرفتە گرنگانەی کە توێژینەوەی لەسەر بکرێت ، د - لایەنگری بەکارهێنانی ئەنجامی توێژینەوەکان .

## رۆڵە بەرفراوانەکانی پیشەیی

پەرستاران رۆڵی دیکەی پیشەیی کە بەرفراوان بوونەتەوە بەجێ دەگەیەنن وەك پەرستاری پیشەگەر (شارەزا لە کاری خۆی) ، پەرستاری تایبەت بە کلینیك ، پەرستاری مامان، پەرستاری فێرکەر (ماموستا) ، پەرستاری توێژینەوەر ، پەرستاری بێهۆشکەر، هەموو ئەوانە رێ بە پەرستار دەدەن کە زیادتر سەربەخۆ و سەربەست بن (خشتەی ٢).

**پەرستاری پیشەگەر**

پەرستارێکە کە بڕوانامەی پێشکەوتووی هەیە و لە دەزگایەکی تایبەت بە پەرستاری پیشەگەر دەرچووە . ئەم پەرستارانە بڕوانامەیان پێ دەدرێت لەلایەن سەنتەری بڕواپێدەری پەرستارانی ئەمریکا (American Nurses Credentialing Center) لە بوارێکی تایبەتدا وەك، پەرستاری پیشەگەری گەورەکان، پەرستاری پیشەگەری خێزان، پەرستاری پیشەگەری قوتابخانە ، پەرستاری پیشەگەری منداڵان ، پەرستاری پیشەگەری بەساڵاچووان. ئەمانە کە ئاژانسەکانی چاودێری تەندروستی یان ئەو شوێنانەی کە لەسەر بنچینەی سوودمەندی گشتی ئیش دەکەن زۆربەی جار خزمەتگوزاری پێشکەش بە نەخۆشیە درێژخایەنەکان خەڵك و حاڵەتەکانی ناتەنگاوی دەکەن و چاودێری سەرەتایی گەرۆك پێشکەش دەکەن .

**پەرستاری کلینکی تایبەت**

پەرستارێکە کە پلە یان شارەزایی پێشکەوتووی هەیە و بە پسپۆر لە بواری خۆیدا لە قەڵەم دەدرێت. (وەك جرنتۆلۆژی "زانستی بەساڵاداچووان"، شێرپەنجەناسی) ئەم پەرستارانە چاودێری راستەوخۆ پێشکەش دەکەن، خەڵکانی تر فێردەکەن ، راوێژکاری وە توێژینەوە ئەنجام دەدەن و بەڕێوەبەری چاودێرییەکانن . سەنتەری بڕواپێدەری پەرستارانی ئەمریکا ، بڕوانامەی فەرمی لە بواری تایبەتی کلینیکی پێیان دەبەخشێت .

**پەرستاری بێهۆشکەر**

پەرستارێکە کە خوێندنی باڵای خۆی لە پرۆگرامی بێهۆشکاری تەواو کردووە . ئەم پەرستارە دیتنی پێش نەشتەرگەری و هەڵسەنگاندن ئەنجام دەدات وە بێهۆشی گشتی ئەنجام دەدات بۆ نەشتەرگەری لە ژێر سەرپەرشتی پزیشکی بێهۆشکەردا، هەروەها ئەم پەرستارە هەڵسەنگاندنی باری نەخۆشی دوای نەشتەرگەری لە ئەستۆی دایە.

**پەرستاری مامان**

پەرستارێکی دامەزراوە کە پرۆگرامی مامانی تەواو کردووە و لە لایەن کۆلیژی پەرستارانی مامانی ئەمریکایی بڕوانامەی پێدراوە . ئەم پەرستارە چاودێری لە کاتی دووگیانی و پاش منداڵبوون پێشکەش دەکات و پرۆسەی منداڵبوون لە دووگیانی نۆرمالدا بەڕێوە دەبات . ئەم مامانە کار دەکات لەگەڵ

ئاژانسێکی چاودێری تەندروستی و دەتوانی خزمەتگوزاری پزیشکی ئەنجام بدات ئەگەر گرفت ڕوویدا. پەرستاری مامان هەروەها دەتوانێت پشکنینی " پاپ سمیر " (Papanicolaou smears)، ڕێکخستنی خێزان و پشکنینی مەمك ئەنجام بدات .

## پەرستاری توێژینەوەر

ئەم پەرستارە بە مەبەستی پێشخستنی چاودێری پەرستاری وە بۆ چاکسازی و بەرفراوان کردنی زانیاری پەرستاری لە گرفتەکان دەکۆڵێتەوە. ئەمانە لە زانکۆ و نەخۆشخانەکانی فێرکاری و سەنتەرەکانی توێژینەوە وەك پەیمانگای نەتەوەیی بۆ توێژینەوەی پەرستاری لە بتسدا (Bethesda) ماری لەند (Maryland) کاردەکەن . ئاستی خوێندەواری ئەم پەرستارانە دکتۆرایە .

## پەرستاری بەڕێوەبەر

پەرستاری بەڕێوەبەر ئەرکی چاودێری کردنی تەندروستخوازی لە ئەستۆدایە کە بریتیە لە گەیاندنی خزمەتگوزاری پەرستاری . بەڕێوەبەر لەوانەیە شوێنێکی مام ناوەندی هەبێت وەك لێپرسراوی نهۆم یان گەورەتر وەك بەڕێوەبەری خزمەتگوزاری پەرستاری. ئەرکەکانی پەرستاری بەڕێوەبەر بریتین لەدانانی بودجە ، وەرگرتنی ستاف وە پرۆگرامی پلاندانان . بە لای کەمەوە ئاستی خوێندەواری پەرستاری بەڕێوەبەر دەبێت بەکالوریوس لە پەرستاری و یان ماستەرو دکتۆرا بێت.

## پەرستاری فێرکەر یان مامۆستا

پەرستاری فێرکەر لە بواری پرۆگرامەکانی پەرستاریدا وەك پەیمانگاکانی فێربوون و فێرکردنی ستافی نەخۆشخانە کاردەکات. پەرستاری فێرکەر زۆربەی جار ئاستی بەکالوریوس یان زیادتری هەیە و خولی زۆری دیتووە لەبوارێکی کارکردن دا. پەرستاری فێرکەر بەرپرسی ژوورەکانی خوێندن و فێرکردنی کلینیکالە .

## پەرستاری بازرگان

پەرستارێکە کە پلەیەکی بەرزی زانستی هەیە وە دەزگایەك یان ئیشێك کە پەیوەندی بە کاری تەندروستیەوە هەیە بەڕێوە دەبات . ئەم پەرستارە لەوانەیە لە بواری فێرکردن، ڕاوێژکاری یان توێژینەوەش کار بکات.

---

# تایبەتمەندی پیشە

پەرستاری ڕێز و ناوبانگی وەك **پیشە** بەدەست هێناوە . پیشە وەك کارێك پێناسە دەکرێت کە پێویستی بەخوێندنی بەرفراوان یان بەمانای تر پێویستی بە زانیاری تایبەت و شارەزایی و ئامادەکاری هەیە . پیشە بەم شێوەیە لە کار جیاواز دەکرێت : أ- پێویستی بە راهێنانی درێژخایەن و تایبەتە بۆ بەدەست هێنانی زانیاری سەبارەت بە رۆڵەی کە دەبێت ئەنجام بدرێت . ب- زانیاری کەسی سەبارەت بە جۆری خزمەتگوزاری، چ بۆ کۆمەڵگا یان بۆ رێکخراو بێت ج- پێشخستنی توێژینەوە ، د- پرێنسیپی رەوشتی ، هـ- سەربەخۆیی، ی- رێکخراوەی پیشەیی.

دوو وشەی کە پەیوەستن بە پیشە پێویستە جیاواز بکرێن: **پیشەگەرێتی** (Professionalism) وە **دروستبوونی پیشە** (Professionalization).

**پیشەگەرێتی** دەگەرێتەوە بۆ تایبەتمەندیی ووزە یان شێوازەکان. کۆمەڵێك نیشانەن و رێگایەکی ژیانە کە بەرپرسیارێتی و پەیمانەکان دیاردەکات. پیشەگەرێتی پەرستاری قەرزداری کاریگەریەکانی فلۆرانس نایتینگلە. **دروستبوونی پیشە** پرۆسەی بوون بە پیشەیە کەمانای بەدەست هێنانی تایبەتمەندی پیشەیی دەگەێنێت .

## خوێندنی تایبەت

خوێندنی تایبەت یەکێکە لە گرنگترین لایەنەکانی پیشە. لە رۆژگاری ئەمڕۆدا، ئارەزووی خوێندن بۆ پیشەیەك گواستراوەتەوە بۆ ناو پڕۆگرامی کۆلیژ وە زانکۆیەکان .

زۆربەی مامۆستاکانی پەرستاری بڕوایان وایە کە پڕۆگرامی خوێندنی پەرستاری بەکالوریوس دەبێت بریتی بێت لە هونەرەکانی فێرکردن و خوێندنەوە سەرەرای زانستەکانی زیندەوەرزانی و کۆمەڵایەتی و پەرستاری .

ئەمڕۆ لە وڵاتە یەکگرتووەکان پەرستاران بە پێنج جۆرە بڕوانامەی پەرستاری دادەمەزرێن: **دیپلۆمی نەخۆشخانە** ، **پلەی هاوکار** (Associate degree)، **پلەی بەکالوریوس**، **پلەی ماستەر** ، **پلەی دکتۆرا** . کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکا پلەی بەکالوریوس پێشنیار دەکات وەك کەمترین ئاست بۆ چوونە ناو کاری پیشەیی. بەپێچەوانەوە رێکخراوی نەتەوەیی بۆ پەرستاری بە پلەی هاوکار (National organization for Associate Degree Nursing ) پالپشتی دەکات لەو پەرستارانەی کە پلەی هاوکاریان هەیە بۆ چوونە ناو پەرستاریی دامەزراو .

## ناوەڕۆکی زانیاری

وەك پیشە، پەرستاری بە ناوەڕۆکی زانیاری و کارامەیی تایبەت بە خۆی بینا کراوە کە بە باشی پێناسە کراوە. هەندێك لە چوارچێوەی بیرۆکەکانی

پەرستاری بەشدارن لە بنەمای زانیاری پەرستاری و ڕێ پێشاندەری کاری پەرستاری و فێرکردن وخوێندن و توێژینەوە.

## پێناسینی خزمەتگوزاری

ناسینی جۆری خزمەتگوزاری پەرستاری، کاری پەرستاری لە ئیشی ئاسایی جیا دەکاتەوە کە تەنیا مەبەستی سوودمەندیە بۆ خاوەنەکەی. زۆر کەس سوودی خەڵك ویستن و خۆنەویستن بە نیشانەی ڕەسەنی پیشەیەك دەزانن . پەرستاری هەر لە کۆنەوە خزمەتکردنی خەڵکی تر بووە . ئەم خزمەتگوزاریە هەروەها دەبێت بە یاسا و ڕێبازێکی تایبەت و پرێنسیپی ڕەوشتی ڕێنمایی بکرێت. ئەمڕۆ، پەرستاری بەشێکی گرنگی سیستەمی بەرهەم هێنانی چاودێری تەندروستیە .

## پێش بردنی توێژینەوە

زیادبوونی توێژینەوە لە پەرستاریدا هاوبەشە لە گەڵ کاری پەرستاری. لە ساڵانی ١٩٤٠دا ، توێژینەوەی پەرستاری لە قوناغێکی زۆرسەرەتایدابوو . لە ساڵانی ١٩٥٠زیاد بوونی بوودجەی فدرال و پاڵپشتی پیشەیی یارمەتی دامەزراندنی سەنتەرەکانی بۆ توێژینەوەی پەرستاری داوە . لە سەرەتادا زۆربەی توێژینەوەکان بۆ فێرکردنی پەرستاری بووە . لەساڵانی ١٩٦٠دا ، توێژینەوەکان زیادتر سەبارەت بە سروشتی ئەو زانیارییانە بوون کە بنچینەی

پەرستارییان پێك دەهێنا. تاسالّانی ١٩٧٠دا ، تویژینەوەی پەرستاری تیشکی خستبووە سەر بابەتەکانی کاری پەرستاری.

## پرێنسیپی رەوشتی

پەرستاران هەر لە کۆنەوە بەهایەکی زۆریان داوە بەرێزلێنان لە خەڵکی تر. پیشەی پەرستاری پێوستی بە یەکگرتنی ئەندامەکانیان هەیە بۆ ئەوەی کە هەر ئەندامێك بزانێت ئەنجامدانی چ شتێك مافە بێ لەبەرچاوگرتنی ئاستی کەس . پرێنسیپی رەوشتی دەگۆرێت بەپێی پێداویستی و بەها کۆمەڵایەتی. پەرستاران پەرەیان داوە بەو دەستورە و لە زۆرجێگاش دا رێگەیان داناوە بۆ چاودێری کردنی رەفتاری ئەندامەکانیان .

## سەربەخۆیی

پیشەیەك سەربەخۆیە کە خۆی رێك بخات وە پێوەر دابنێت بۆ ئەندامەکانی. پێشکەش کردنی سەربەخۆیی یەکێك لە ئامانجەکانی کۆمەڵەیەکی پیشەییە . ئەگەر پەرستاری حاڵەتی پیشەیی هەبێت ، دەبی بە سەربەخۆیی کار بکات لە دروست کردنی رێباز و کۆنترۆڵی چالاکیەکانیدا . بۆ سەربەخۆ بوون . گروپێکی پیشەیی دەبێت دەسەڵاتێکی یاسایی پێ ببەخشرێت بۆ پێناسە کردنی مەودای کاریان و وەسف کردنی ئەرکە تایبەتیەکان و رۆڵ و دیار کردنی ئامانج و لێپرسراوەتیەکان لە بەرهەم هێنانی خزمەتگوزاری .

بۆ پیشەیەکی وەك پەرستاری سەربەخۆیی واتە سەربەست بوون لە کاردا، لێپرسراوەتی و بەرپرسیارێتی لە کارەکاندا . سەربەخۆیی ئاسانتر بەدەست دێت و دەپارێزرێت ئەگەر دەسەڵاتێك بەدەستەوە بێت . لەبەر ئەوە، هەندێك پەرستار بەدوای شوێنی بەرێوەبەرایەتیدا دەگەڕێن بۆ بەرفراوانکردنی شایستەیی کلینیکاڵی بۆ مسۆگەر کردنی سەربەخۆییان لە شوێنی کار دا .

## رێکخراو یان دام و دەزگای پیشەیی

کارکردن لە ژێر چەتری رێکخراو یان دام ودەزگای پیشەییدا ، پیشە لە ئیش جیا دەکاتەوە . فەرمانرەوایی کردن ، دامەزراندن و پاراستنی رێکخستنەکانی کۆمەڵایەتی و رامیاری و ئابوورییە لەو رێگایە کە پیشەگەر کار و زانست و بارودۆخی ئیش کردن و کارو باری پیشەی خۆی کۆنترۆل دەکات . پەرستاران بەم شێوەیە پێوستیان بەکارکردن لە رێکخراو یان دام و دەزگاکانی پیشەییدا هەیە.

کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکا رێکخراوێکی پیشەییە کە پیشەی پەرستاری پێش دەخات لە رێگای گەشەپێدانی پێوەرەکانی کاری پەرستاری، پێشخستنی باری ئابووری و گشتی پەرستاران لە شوێنی کارکردنیاندا ، پلان دانان بۆ تێروانینێکی پۆزەتیف و راستەقینە لە پەرستاریدا و پرۆپاگەندە کردن لە لایەن کۆنگریس و لایەنەکانی یاسایی لەسەر بابەتەکانی چاودێری پەرستاری کە کاریگەرە لە سەر پەرستاری و جەماوەر .

# کۆمەڵسازی لە پەرستاری

پێوەرەکانی خوێندن و کار بۆ پیشە لە ڕێگای ئەندامەکانی ئەو پیشەیە دیاری دەکرێن نەك خەڵکی تر. خوێندن و فێربوونی پیشەیەك گیرۆدەی پرۆسەیەکی تەواوی کۆمەڵسازی دەبیت وە گەیشتن بە قووڵایی لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و بۆچوونەکان و سیمای تکنیکی بە خۆوە دەگرێت کە لە بوارەکانی تر بەم شێوەیە نیە.

کۆمەڵسازی دەتوانێت بە سادەیی پێناسە بکرێت : *پرۆسەیەك کە لە ڕێگای ئەودا خەڵك: أ- فێردەبن ببن بەئەندامی گروپ و کومەڵەکان، ب- فیری ئەو یاسا کۆمەڵایەتیانە دەبن کە پەیوەندیەکانی نێوانیان پێناسە دەکەن.* کۆمەڵسازی فێربوونی ڕەفتار کردن ، هەست کردن و دیتنی جیهان بەشێوازێك وەك خەڵکانی تری خاوەن هەمان ڕۆڵ. ئامانج لە کۆمەڵسازی پیشەیی چەسپاندنی ڕەوشتی ئاسایی، بەهاکان ، بۆچوون و ڕەفتاری زانراوە کە پێویستن بۆ مانەوە و بەردەوام بوونی پیشەیەك .

مۆدیلی جۆراوجۆر بۆ پرۆسەی کۆمەڵسازی گەشەپێداوە . مۆدیلی " بنێر" (٢٠٠١) پێنج ئاستی کارامەیی لە پەرستاریدا دەخاتەروو کە لەسەر بنەمای مۆدیلی گشتی بەدەست هێنانی شارەزایی و کارامەیی "دێریفوس" ە . ئەم پێنج قۆناغە، کە بۆ فێرکردن و فێربوون بەکاردێن بریتین لە تازەکار ، تازەکاری

پێشکەوتوو ،شارەزا، کارامە ، پسپۆر . بنێر دەنووسێت ئەزمون زۆر پێویستە شارەزایی و زانیاریی پیشەیی (خشتەی ٣).

| خشتەی ٣- قۆناغەکانی بنێر بۆ کارامەیی پەرستاری |
|---|
| **قۆناغی یەکەم: تازەکار**<br>بێ ئەزموونە ( بۆ نموونە قۆتابی پەرستاری ) . ئەرکەکانی سنووردارن ، سەرسەخت و رانەگۆرە و زیادتر بە یاسا و پەیرەو بەرێوە دەچێت تاکو ئەزموون .<br>**قۆناغی دووەم: تازەکاری پێشکەوتوو**<br>کارە پەسەندەکان لێك جیا دەکات . لایەنە ماناداڕەکانی هەر بارودۆخێکی راستەقینە دەناسێت، و بە پێی ئەو ئەزموونەی کە هەیەتی توانای بریاردانی هەیە لە هەر هەلومەرجێکدا .<br>**قۆناغی سێیەم: شارەزایی**<br>دوو تا سێ سال ئەزموونی هەیە .توانای پلان دانان و ریکخراوەیی هەیە، فاکتەرە گرنگ و ناگرنگەکان لێك جیا دەکاتەوە. پێداویستیە ئالۆزەکانی چاودێری جوراجۆر رێك دەخات.<br>**قۆناغی چوارەم : کارامەیی**<br>سێ تا پێنج سال ئەزموونی هەیە. لە بارودۆخەکان بە گشتی نەك بەش بەش تێ دەگات بە پێچەوانەی قۆناغی دووەم. تێگەیشتێنکی گشتی سەبارەت بەتەندروستخواز هەیە کە دەبێتە هۆی پێشکەوتنی لە بریارداندا . جەخت دەکاتە سەر ئامانجە درێژخایەنەکان .<br>**قۆناغی پێنجەم : پسپۆر**<br>کارەکانی لە گۆرپندایە، نەرمە و زۆر شارەزایانە ئەنجامیان دەدات ، زۆر پێویستی بەیاسا و پەیرەو و رێنماییەکان نیە بۆ تێگەیشتن لە بارودۆخەکان بۆ کاری گونجاو. زۆر شارەزایانە شرۆڤە دەکات و بە توانایە لە روونکردنەوەی بارودۆخە نوێیەکاندا. ئارەزوو دەکات بۆ ئەنجام دانی کاریکی تایبەت چونکە بە دروستی هەستی پێدەکات . پێویستی بەیاسا و پەیرەو و رێنمایی نیە بۆ تێگەیشتن لە بارودۆخەکان بۆ ئەنجامدانی کاری گونجاو. |

یەکێك لە میکانیزمە بەهێزەکانی کۆمەلسازی پیشەیی تێکەڵ بوونی قوتابییە هاورێکانە لەگەڵ یەکتریدا. بە پێی کەلتوری قوتابیان، هەموویان پێکەوە ئاست و ئاراستەی هەوڵە زانستی و ئەکادیمیەکانی خۆیان دیاریدەکەن . ئەوان گەشە بە تێروانینی خۆیان دەدەن سەبارەت بەو بارودۆخانەی کە تێیکەوتوون. ئەو ئامانجانەی کە بۆیان هەوڵ دەدەن ، جۆری ئەو چالاکیانەی کە سوودمەند و گونجاون ،کۆمەڵێك کار دادەمەزرێنن کە گونجاون لەگەڵیاندا. قوتابیان بە هەستی هاوکاری دوولایانە و پاڵپشتی و یەکبوونیان پێکەوە دەبەسترێنەوە .

## گرنگترین بەهاکانی پەرستاری

پەرستار لە ناو پرۆگرامی خویندندا بەها پیشەییەکانی گەشە پیددات و روونی دەکاتەوە و دەیکاتە بەشێك لەخۆی و بیرو باوەری . بەهاکانی تایبەتی پیشەیی پەرستاری لە پرێنسیپی رەوشتی پەرستاریدا، لە پێوەرەکانی کاری پەرستاری و لە سیستەمە یاساییەکەیدا هاتووە . هەروەها لە ساڵی ٢٠٠١ دا، کۆمەڵەی نەتەوەیی پەرستارانی قوتابی دەستورێکی بۆ رەوشتی ئەکادیمی و کلینیکی پەسەند کرد (خشتەی ٤).

پیشەکی

قوتابیانی پەرستاری لێپرسراوی کۆمەڵگان لە فێربوونی شارەزایی تیوری و کلینیکی ئەکادیمی کە پێویستن بۆ پێشکەش کردنی چاودێری پەرستاری. شوێنی کاری کلینیکی بەرنگاربوونەوە ولێپرسراوەتی بێ هاوتا دروست دەکات لە کاتی کە چاودێری کردنی لە مرۆڤ لە کەش و هەوا جیاوازەکانی چاودێری تەندروستیدا.

پرێنسیپی رەوشتی ئەکادیمی و کلینیکی پێویستە بە شێوەیەك بێت کە قوتابی بە چاکی ئەو کۆمەڵگایەی کە تێیدا دەژیت بناسێت . ناوەرۆکی ئەم پرێنسیپە رەوشتیە دەبێت بە شێوەیەك بێت کە یارمەتی قوتابی بدات بۆ بیناکردن و پتەوکردنی بنەما ئەخلاقیەکانی. ئەویش بە شێوەیەك کە لە هەموو رەفتاری رۆژانەیدا رەنگبداتەوە و یارمەتی گەشەی کەسایەتی قوتابی بدات.

دەستورێك بۆ قوتابیانی پەرستاری کاتێك کە دەچنەناو کەش و هەوای ئاکادیمی و کلینیکیدا:

بروامان وایە کە بنچینەکانی رەوشتی وەك رێپێشاندەرێك پێویستن بۆ پێشخستی پیشەکە. بەم شێوەیە پشنیار دەکەین بۆ :

١- ئامۆژگاری کردن بۆ مافەکانی هەموو تەندروستخوازان .

٢- پاراستنی نهێنیەکانی تەندروستخواز .

٣- ئەنجام دانی کاری گونجاو بۆ دلنیا بوون لە نەهێشتنی مەترسی لە سەر تەندروستخوازان و خۆی و دەوروبەری .

٤- پێشکەش کردنی چاودێری بۆ تەندروستخواز لە کاتی خۆیدا و بەشێوازێکی پیشەیی و بە دڵسۆزی.

٥- بەشێوازێکی دروست و راستگۆیی و لە کاتی خۆیدا قسە لە گەڵ نەخۆش بکرێت.

٦- بەرزترین ئاستی بنەمای رەوشتی راست بە کار بێنێن و لێپرسراویەتی کارەکانمان قەبوڵ بکەین.

٧- له تەواوی تەمەندا لە سەر ڕێگای فێربوون بێت بۆ پێشخستنی پیشەکەی و گەشە کردنی کاری پەرستاری.

٨- بە ڕێز لێنان خەڵك چارەسەر بكەن و كەش وهەوایەكی وا دروست بكەن كە مافی مرۆڤ و بەهاكان، كەلتور و بیر و باوەڕی مەعنەوی تێدا پارێرزراو بیت.

٩- بۆ دڵنیا بوون لە باشترین جۆری چاودێری لە شێوازێكی شیاو و پەسەندا لە گەل ئەندامانی ئاكادیمی و ستافی كلینیكی هاوكار بن.

١٠- لە هەر هەلێەك سوود وەربگیرێت بۆ گەشەپێدانی توانای ماموستایان و ستافی كلینیكی بۆ تێگەشتن لە پێداویستیەكانی قوتابیانی پەرستاری.

١١- ماموستایان و ستافی كلینیكی و گروپەكان هان بدەن بۆ ئامۆژگاری كردنی قوتابیانی پەرستاری.

١٢- ڕێگا نەدان بە قوتابیان بۆ ئەنجامدانی ئەو تەكنیك و كردارانەی كە ڕاهێنانیان لە سەری ئەنجام نەداوە.

١٣- خۆپاراستن لە ڕاسپاردنی هەر كارێك یان چاودێرییەك بە قوتابیان لە ئاكادیمی یان كلینیك كە مەترسی ناخوازراو دروست دەكات بۆ تەندروستخواز و خۆیان و خەڵكی تر.

١٤- یارمەتی ستافی پەرستار یان ماموستا بدەن بۆ دلنیا بوون لە سەربەخۆیی تەواوی تەندرۆستخواز سەبارەت شێوەی چارەسەركردن و توێژینەوە بە شێوەیەكی ڕوون و ئاشكرا.

١٥- لە خواردنەوەی مەشروباتی ئەلكحولی و ماددەكانی تری بێهۆشكەر لە كۆلێژ و شوێنی كلنیكی خۆتان بپارێزن بۆ ئەوەی بڕیاری دروست بدەن.

١٦- هەوڵ بدەن بۆ گەیشتن و ڕاگرتنی بەرزترین ئاستی سەلامەتی خۆتان.

١٧- یارمەتی ئەو قوتابیانە بدەن كە تووشی بە كار هێنانی ماددە بێهۆشكەرەكان بوونە و لە ڕووی جەستەیی و عەقلیەوە زامدارن..

١٨- سیاسەتەكان و یاساكانی قۆتابخانە سەبارەت بە كارە ئاكادیمی و كلینیكەكان بەرز بكەن و مافی بەرنگار بوونەوە و ڕەخنە گرتن لە یاسا وە پەیرەوەكان بپارێزن.

# فاکتەرە کاریگەرەکانی کاری پەرستاری سەردەم

بۆ تێگەیشتن لەکاری پەرستاری لەم سەردەمە و داهاتوودا، پێویستە لە هەندێك هێزی کاریگەری کۆمەڵایەتی تێبگەین. ئەم فاکتەرانە کاریگەریان هەیە لە سەر ناخی سیستەمی چاودێری تەندروستی و پەرستاری وەك بەشێکی گەورەی ئەم سیستەمە ناتوانرێت رێگای لێ بگیرێت.

## ئابووری

پاڵپشتە داراییە گەورەکان لەلایەن جەماوەر و پرۆگرامی بیمەی تەندروستی کەرتی تایبەت بووەتە هۆی زیادبوونی پێویستی چاودێری پەرستاری. لە ئەنجامی ئەوەدا، ئەو خەڵکەی کە لە رابردوودا نەیاندەتوانی چاودێری تەندروستی وەربگرن ئێستا رۆژ بە رۆژ زیادتر سوودمەند دەبن لەم جۆرە خزمەتگوزاریانە وەك بەشی چاودێری فریاکەوتن، راوێژکاری تەندروستی عەقلی و پشکنینی جەستەیی بۆ خۆپاراستن. لە ساڵانی رابردوودا نرخی چاودێری تەندروستی هەر لە زیادبووندا بووە. لەساڵی ١٩٨٢، سیستەمی پارەدانی پزیشکی بۆ خزمەتگوزاریی نەخۆشخانەکان و پزیشکەکان، پێدا چوونەوەی بۆکرا بە مەبەستی دارشتنی کرێ بە گوێرەی دەست نیشان کردنی پزیشکی. ئەم جۆرە سیستەمەی پۆلێن کردن بە گرووپی پەیوەنددار بەدەست

نیشان کردن ( Diagnostic-related groups) ناسراوه. لەم سیستەمەدا لیستی دەستنیشان کردنەکانی پزیشکی پۆلێن کراوە. بە بەکارهێنانی ئەم یاسایە ئەو کەسانەی کە بەراستی نەخۆشن و پێویستیان بە خەواندن هەیە لە نەخۆشخانە دەمێنێنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا نرخەکانی چاودێری تەندروستی روو لە زیادبوون دایە.

ئەم گۆڕانکاریانە پەلیان هاوێشتووە بۆ ناو بواری پەرستاریش. بە رێگای تاقی کردنەوەکانی پێش خەواندن، زیادبوونی نەشتەرگەری یەك رۆژی، چاکسازی پاش خەواندن لە نەخۆشخانە، چاودێری تەندروستی ناو ماڵان. پاراستنی تەندروستی، پرۆگرامەکانی رێك و پێکی جەستەیی و پرۆگرامەکانی فێرکردنی تەندروستی کۆمەڵایەتی جەخت لەوە کراوەتەوە کە خەواندنی نەخۆش لە نەخۆشخانە کەم بکرێتەوە. لە ئەنجامدا، ژمارەیەکی زیاتری لە پەرستاران لە شوێنەکانی تەندروستی کۆمەڵگادا سەرقاڵن وەك ئاژانسەکانی تەندروستی ناو ماڵان، خانەی بەساڵاداچووان و کلینیکە جەماوەریەکان. ئەم گۆڕانکاریانە لە جۆری ئیش کردنی پەرستاراندا تێکەڵ بە خوێندنی پەرستاری، توێژینەوەی پەرستاری و کاری پەرستاری کراوە.

## پێویستەکانی تەندروستخواز یان بەکارهێنەر

بەکارهێنەرەکانی خزمەتگوزاریەکانی پەرستاری ( خەڵك ) هێزێکی کاریگەربوونە لە زیاد بوونی گۆڕانکاری لە کاری پەرستاری دا. بەگشتی،

ئاستی خوێندەواری خەڵك باشتربووە، زانیاری زیاتریان هەیە سەبارەت بە تەندروستی و نەخۆشی بە بەراورد لە گەڵ رابردوودا. بەکارهێنەرەکان، هەروەها هۆشیاریان زیادتر بووە بەرامبەر بە پێویستەکانی دیکەی چاودێری. بابەتەکانی رەوشتی و رەفتاری بوونەتە هۆی ئەوە کە خەڵك زیادتر باس لە پێداویستیەکانی هەژاران و گروپە کەمینەکان بکەن .

چەمك و ماناکانی تەندروستی و پەرستاری، هەروەها لە ناو خەڵکیشدا گۆڕاوە. ئیستا ئەو باوەرە جێگیر بووە کە تەندروستی مافی خەڵکە، نەك مافی تایبەتی زەنگینەکان. دەزگانی راگەیاندن جەخت لە سەر ئەم پەیامە دەکەن کە خەڵك دەبێت بەرپرسیارێتی سەلامەتی خۆیان لە ئەستۆ بگرن بە رێگای پشکنین جەستەیی بە رێك و پێکی، پشکنین بۆ حەوت نیشانەی مەترسیداری شێرپەنجە، راگرتنی سەلامەتی دەروونی لە رێگای هاوسەنگ کردنی کار و خۆشگوزەرانیدا. ئارەزووی و خزمەتگۆزاری تەندروستی و پەرستاری ئێستا لە هەر کاتێك زیادتر بووە. ئێستاکە خەڵك زیادتر دەیانەوێت رزگاربن لە نەخۆشی، ئەوانە هێز و زیندوویەتی و هەست بە سەلامەتبوونیان دەوێت.

رۆژ بەرۆژ. بەکارهێنەر بەشدار بوونێکی چالاکانەتر لە بڕیارداندا سەبارەت بە تەندروستی و چاودێری پەرستاری دەکات. کۆمیتەکانی پلانداانان جەخت لە سەر پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری پەرستاری بۆ کۆمەلگا دەکەن کە زۆربەی جار بەکارهێنەر ئەندامێکی چالاکە لەم کۆمیتەیەدا. بۆ ئاگادار بوون بە دروستی

لـە ئاسـتی داهـاتی خـەڵك زۆربـەی كۆمەڵـەكانی پەرستاری و ئاژانـسەكانی ڕێكخستن، نوێنەری بەكارهێنەریان هەیە لە دەسەلاتیاندا.

## پێكهاتەی خێزان

پێكهاتـەكانی نـوێی خێـزان وای كـردووە پێویـستی بـە خزمەتگوزاریـەكانی پەرستاری زیادتر بێـت. زۆربـەی خـەڵك دوور لـە بنەماڵـەی خۆیـان دەژیـن و بەخێوكەری خێزانن، مەرج نیە پیاو لە ماڵ بێت ( ئەم بارودۆخە لە كۆمەڵگای ئەوروپیە و لە كوردستان پێكهاتەی خێزان وەك خۆی ماوەتەوە ). لە ئـەمڕۆدا، زۆربەی پیاوان بەتەنیا و ئافرەتان بەتەنیا منداڵانی خۆیان بەخێودەكەتن و لـە زۆربەی خێزانەكان ، دایك و بـاوك، هـەردووكیان ئـیش دەكـەن. وا بـاوە كـە دایك و باوكی نوێ دوور بژین لە دایك و باوكی خۆیـان. ئـەم خێزانـە نوێیانـە پێویستیان بە پاڵپشتی هەیە.

دایكە هەرزەكارەكان، هەروەها پێویستیان بەخزمەتگوزاری پەرستاری هەیە هەم لە كاتی دووگیان بوونیاندا و هەم پاش منداڵبوونیان. پێویـستیەكانیان پێویـستی ئاسایی هەرزەكارەكانە لە لایەك و لەلایەكیش دایكایەتیە. زۆربەی ئەم دایكـە هەرزەكارانە منداڵی خۆیان بەتەنیا بەخێو دەكەن ئەگەر هیچ یارمەتیـەكیان لـە لایەن باوكەوە هەبێت یان نەبێت، ئەم جۆرە خێزانە یەك كەسیە ( تەنیا دایك ) زۆر ناسكن بەئاسانی تووشی گرفت دەبن چونكە دایكایەتی تێكەڵ بـە بـاری سـەخت و ئـاڵۆزی هـەرزەكاری دەبێـت. و لـە بـەر ئـەوەی كـە زۆربـەی ئـەم

خێزانانە لە هەژاریدا دەژین، منداڵەکانیان بە گوێرەی پێویست ڤاکسینە ناکرێن و لە بەردەم مەترسی زیادتری گیرو گرفتەکانی تەندرۆستی و خۆراك دەبن.

## زانست و تەکنۆلۆژی

پێشکەوتن لە زانست و تەکنۆلۆژیدا کاریگەری هەبووە لە سەر کاری پەرستاری. بۆ نموونە، ئەو کەسانەی کە نەخۆشی ئایدزیان هەیە دەرمانی نۆی وەردەگرن بۆدواخستنی ئەو گیروگرفتانەی کە بە هۆی ئەم نەخۆشیەوە تووش دەبن. پەرستاران دەبێت زانیاریان هەبێت لەسەر کاری ئەم جۆرە دەرمانانە و پێداویستی ئەم نەخۆشانە. بیوتەکنۆلۆژی (Biotechnology) کاری کردووەتە سەر چاودێری تەندرۆستی. بۆ نموونە پەرستار رووبەرووی پەیدابوونی تەکنۆلۆژی بۆماوەیی بووە وەك بواری چارەسەر کردنی شێرپەنجە. پەرستاران پێویستیان بە فراوان کردنی بنچینەی زانیاری و کارامەیی تەکنیکی خۆیان هەیە بۆ ئەوەی کە بتوانن خۆیان بگونجێنن لەگەڵ پێداویستیەکانی نوێی تەندروستخوازاندا.

لە هەندێك جێگادا پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی وای کردووە پەرستار لە کاری خۆیدا زۆرپسپۆر بێت. پەرستاران گەلێك جار ئامێری کۆمپیوتەری وورد بۆ چاودێری کردن و چارەسەر کردنی تەندروستخوازان بە کار دەهێنن. لەگەڵ گۆرینی تەکنۆلۆژیادا، خوێندنی پەرستاریش گۆراوە و پەرستاران پێویستیان بە فێر بوون هەیە بۆ پێشکەش کردنی کاری پەرستاری کاریگەر و سوودمەند و بێ مەترسی.

پرۆگرامی ئاسمانی بووەتە خاوەن تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوو بۆ سەفەری ئاسمانی، چونکە پێویستیان بەوە هەبووە کە چاودێری فەزایی و ئاسمان بکەن لە دوورەوە و هەروەها ماددە ڕۆناکبەخشەکان و بچووك کردنەوەی ئامێرەکان. چاودێری تەندروستیش سوودی وەرگرتوە لەم تەکنۆلۆژیە تازەیە کە بە شێوەیەك دروست کراوە کە بۆ کاری پزیشکی بە کار بێت وەك ئەستێرەبین ( کە بۆ پەککەوتنی بینین بە کار دێت) ، پۆمپی تێکردنی ئەنسۆلین ، ویلچێر کە بە دەنگ کۆنترول دەکرێت، وێنە گرتنی لەرەلەری مۆگناتیسی، نەشتەرگەری بە لێزەر. فیلتەر بۆ ئامێرەکانی کۆنترۆڵی شلە لە ڕێگای دەمارە خوێن هێنەرەکان و چاودێری کردنی سیستەمەکانی کۆمپیەتەری بۆ چاودێری چڕ.

## زانیاری و پەیوەندی دوور

(Information & Telecommunications )

زانیاری ئینتەرنێتی کاری کردووتە سەر چاودێری تەندروستی. بەم شێوەیە تەندروستخوازان سەبارەت بە تەندروستی رۆژ بە رۆژ زانیاری زیادتر بە دەست دەهێنێن. ئەو کەسانەی کە نەخۆشن بە تایبەت ئەوانەی نەخۆشیەکەیان درێژخایەنە وە گیانیان لە مەترسی دایە تێنوترین کەسن بۆ بە دەست هێنانی زانیاری. بەم شێوەیە پەرستاران پێویستیان بە لێکدانەوەی سەرچاوەکانی ئەم زانیاریانە هەیە بۆ تەندرۆستخواز و خێزانەکانیان. چونکە هەموو زانیاریەکانی ناو ئینتەرنێت دروست نیە، پەرستاران دەبێت ئەو زانیاریانە رەت بکەنەوە و

هاوکاری خەڵك بکەن بۆ دەست هێنانی باشترین ئاست و تۆڕەکانی باوەر پێکراو. لێکدانەوەی زانیاریەکان و یارمەتیدانی نەخۆشەکان بۆ هەڵسەنگاندنی زانیاریەکان و دیار کردنی سوودمەندی و بێ کەڵکیان.

پەیوەندی دوور واتە گواستنەوەی زانیاری لە شوێنێك بۆ شوێنکی تر بە بەکارهێنانی ئامێرەکانی گواستنەوەی زانیاری بە شێوەی نیشانە، وشە و وێنە و بانگەوازی لە رێگای تەل،رادیۆ و سیستەمەکانی تر. "گرین برگ" ( ٢٠٠٠) ، شی دەکاتەوە کە ئەو وشانەی کە بە tele دەست پێ دەکەن مانای دووری دەدەن، وە بۆ وەسف کردنی زۆربەی خزمەتگوزاریەکانی چاودێری تەندروستی کە لە رێگای پەیوەندی دوورەوەن بە کار دێن.

تەندرۆستی دوور (Telehealth) تەکنۆلۆژیای پەیوەندی دوور بە کار دێنێت بۆ پێشکەش کردنی چاودێری تەندروستی لە دوورەوە. ئەمانە بریتین لە بە کار هێنانی ویدیوکۆنفرانس، کۆمپیوتەر یان تەلفۆن. پەرستاری دوور ( Telenursing) کاتێك روو دەدات کە پەرستار لە رێگای سیستەمی پەیوەندی دوورەوە چاودێری دەکات. نموونەکانی پەرستاری دوور وەك پەرێستارێکە کە بە تەلفون پەیوەندی بە مالّی تەندروستخوازان دەکات بۆ هەڵسەنگاندنی چاکبوونەوەیان یان وەڵامدانەوەی پرسیارەکان، پەرستارێك کە لە ویدیۆکۆنفرانس بەشداردەبێت، راوێژکارەکان یان شارەزاکان لە شوێنە جیاوازەکان باس لە پلانی چاودێری تەندروستی دەکەن، پەرستارێك کە

تەکنۆلۆژی ویدیوفۆن بە کار دینێت بۆ هەڵسەنگاندنی ژیانی تەندرۆستخواز لە شوێنە دوورەکان.

تەندروستی دوور هیچ سنورێك ناناسێت و بۆیەش مەسەلەی هەبوونی بەڵگەنامەی ڕێپێدان سەری هەڵداوە. بۆ نموونە ئەگەر پەرستارێك لە وڵاتی خۆی ڕێپێدراوە کە زانیاری بداتە نەخۆش، ئایا بۆ وڵاتی تر بەڵگەنامەی دەوێت؟ ئەنجومەنی نەتەوەیی بۆردی پەرستاری وڵات گۆڕینی بەڵگەنامەی یەك وڵاتی بۆ چەند وڵاتی پەسند کرد.

## یاسا دانان

یاسادانان سەبارەت بە کاری پەرستاری و بابەتەکانی تەندروستی هەم لە سەر جەماوەر و هەم لە سەر پەرستاری کاریگەر بووە. گۆڕانکاریەکانی تەندروستی هەروەها کاری لە پەرستاری کردووە. بو نموونە یاسای دیاری کردن لە لایەن خودی نەخۆشەوە پێویستی بەوە هەیە کە هەر کەسێکی بالغی خوێندەوار ئاگادار بکرێتەوە لە بارەی مافەکانیان لە کاتی وەرگرتن و خەواندنیان لە بنکەکانی چاودێری تەندروستی بۆ پەسەند کردن یان ڕەتکردنەوەی چاودێری پزیشکی و بەکار هێنانی پێشکەوتووترین ڕێنماییەکان. ئەم یاسایە کە لە زۆربەی بنکەکان جێ بە جێ دەکرێت، کاریگەری هەیە لە سەر ڕۆڵی پەرستار لە پاڵپشتی کردنی تەندروستخواز و خێزانەکانیان.

## دیمۆگرافی

دیمۆگرافی خوێندنەوەی دانیشتوانە کە بریتیە لە ئاماری دابەش بوونیان لە رووی تەمەن و شوێنی نیشتەجێ بوونیان و مردن و نەخۆشی. ئەم زانیاریانە پێویستن بۆ هەڵسەنگاندنی خزمەتگوزاری پەرستاری بۆ نموونە:

- ژمارەی دانیشتوان لە باکوری ئەمریکا زۆر بووە. هەروەها ژمارەی خەڵکی بە تەمەن و بە ساڵداچوو زۆر بووە. ئەمە پێویستی خزمەتگۆزاری زۆر بۆ ئەم گروپە پیشان دەدات.
- خەڵك لە دێهاتەکانەوە بۆ شارەکان کۆچ دەکەن. ئەمە نیشانەی زیادبوونی ئەو گیروگرفتانەیە کە دەرەنجامی پیس بوونە و کاریگەریەکانی زۆر بوونی خەڵکە لە شوێنێك. لە بەرئەوە زۆربەی خزمەتگۆزاری پەرستاری لە شارەکانە.
- زانیاری لە سەر ژمارەی مردن و نەخۆش کەوتووان پیشان دەدەن کە فاکتەرەکانی مەترسی کامانەن. زۆربەی ئەم فاکتەرانە وەك جگەرە کێشان گەورەترین هۆی مردن و نەخۆشیە کە دەتوانرێت بە گۆرینی شێوازی ژیان دوور بخرێنەوە.

## کەم و کۆڕی ئێستای پەرستاری

زۆربەی فاکتەرە کاریگەرەکان کەم و کۆڕی ئێستای کاری پەرستاری (خشتەی ٥) جیاوازن لەوەی پێشوو. پەرستارە دامەزراوەکان گەورەترین گروپی

پیشکەشکارانی چاودێری تەندروستین. لە گەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی کەم دێنە ناو شوێنی کار کردن و شوێنە دووردەستەکان ڕووبەڕووی کەم و کورتی زۆری خزمەتگوزاری پەرستاری دەبن. پێگەیشتنی پەرستار هاوسەنگ نیە لە گەڵ پێویستیدا، بە تایبەتی بۆ پەرستارانی تایبەتمەند ( بو نموونە بۆ چاودێری چڕ)، ئەوە چاوەڕێ دەکرێت کە لە بیست ساڵی داهاتوودا خراپتریش بێت. دیاری کردنی کەم و کۆرتی لە پەرستاریدا پێویستی بە چالاکی هاوبەشی نێوان سیستمەکانی چاودێری تەندرۆستی هەیە، ئەوانەی سیاسەتیان بە دەستەوەیە، ماموستایانی پەرستاری و ڕێکخراوەکانی پیشەیین. پێشنیارەکان ئەمانەن بەڵام بەمانەدا قەتیس ناکرێن:

- دانانی میکانیزمێکی پێشکەوتوو بۆ قوتابیانی پەرستاری بۆ ئەوەی لە پرۆگرامی خوێندنی خۆیاندا بە شێوەیەکی کاریگەرانە و خێراتر پێش بکەون.
- وەرگرتنی خەڵکی گەنج بۆ پەرستاری.
- چاکسازی لە هەلومەرجی کاری پەرستاریدا: دروست کردنی نەرمی زیادتر لە کاتژمێری کارکردندا؛ پاداشت کردنی پەرستارانی بە ئەزموون کە کاری ئامۆژگاری ئەنجام دەدەن و دابین کردنی ستافی پێویست و زیادکردنی مووچەیان.
- زیادکردنی بوودجەی فێرکردنی پەرستاری.

**خشتەی ٥- فاکتەرە کاریگەرەکانی کەم و کورتی کاری پەرستاری**

- به تەمەن بوونی هێزی کاری پەرستاری
  - ژمارەی پەرستارانی ژێر ٣٠ ساڵ کەم بوونەتەوە.
  - ژمارەی پەرستارانی نێوان ٤٠ – ٤٩ ساڵ، کە ٤٠٪ یان گەورەتر دەبن لە ٥٠ ساڵ لە ساڵی ٢٠١٠ دا.
  - دەرچووانی تازە درنگ دێن بۆ کار کردن وە خوازیارن ساڵانی کەمتر بمێننەوە.
- بە تەمەن بوونی مامۆستایانی پەرستاری
  - کاتێك مامۆستایانی پەرستاری خانەنشین دەکرێن مەترسیەکە لە سەر کەمی مامۆستا لە پرۆگرامی خوێندنی پەرستاریدا.
- کەم بوونی هاتنە ناوی گەنجان بۆ کاری پەرستاری
  - کەم بوونی ناونووسین لە پرۆگرامی پەرستاریدا.
- بە ساڵاداچوونی خەڵك
  - ژمارەی کەسانی ٦٥ساڵ و بەسەرەوە دوو بەرامبەر دەبن لەساڵانی نێوان ٢٠٠٠ تا ٢٠٣٠
  - زیادبوونی پێویستیەکانی چاودێری تەندروستی ئەم کەسانە.
- زیادبوونی پێویستی بە پەرستاران
  - زیاد بوونی وریایی تەندروستخوازان و پێویستیان بە پەرستارانی شارەزا و تایبەت .
  - کەم بوونی ماوەی مانەوە لە نەخۆشخانە لە ئەنجامی درێژخایەن بوونی چاودێری و شوێنەکانی پێشکەشکردنی چاودێری تەندروستی لە ناو کۆمەڵگادا، پێویستی بە پەرستارانیان لە ناو کۆمەڵگادا زیاد کردووە.
- گرفتەکانی شوێنی کارکردن
  - کەم بوونی ستاف.

- سەختی و زیادبوونی کار .
- زیادبوونی بەکارهێنانی ماوەی بێکاری و حەسانەوە .
- کەم بوونی پاڵپشتی بۆ ستاف.
- کەمی پاداشت.
- سەختی دامەزراندن و راگرتنی ستاف.

## گفتوگۆی هاوبەش

زۆربەی پەرستاران شێوەی گفتوگۆی هاوبەش بەکاردەهێنن بۆ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەو شتانەی کە لایان گرنگە. کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکا بەشداری دەکات لە گفتوگۆی بە کۆمەڵ وەك پاڵپشتێك بۆ پەرستاران بۆ ژیانی ئابووری و پرۆگرامی گشتی سەلامەتیان. ئەمرۆکە پەرستاران پەیوەندی بەو رێکخراوانە دەکەن کە خشتەی گفتوگۆیان بۆ دادەنێن. پەرستاران زیادتر گرنگیان داوە بە لایەنی ئابووری و لایەنی دروستی چاودێری کردن لە تەندروستخوازان و سەلامەتی کارکردن بۆ خۆیان.

## کۆمەڵەکانی پەرستاری

کۆمەڵەکانی پیشەیی پەرستاری وەك رابەر کار دەکەن کە کاریگەرن لە سەر زۆر لایەنی دیکەی پەرستاری. بایەخ پێدانی یەکێتی نەتەوەیی بەخشینی بڕوانامەی پەرستاری و لیژنەی خوێندنی ئەکادیمی پەرستاری و بە پرۆگرامەکانی خوێندن، کاریگەری هەبووە لە سەر کاری پەرستاری.

زۆربەی پرۆگرامەکانی پەرستاری بە بەردەوامی پێش دەکەون بۆ گەیشتن بە پێوەرەکانی دانپێدانان. لە ئاکامدا پەرستارە دەرچووەکان باشتر ئامادە دەکرێن بۆ گەیشتن بە پێویستیەکانی کۆمەڵگا.

بۆ کاریگەر بوون لە سەر رێبازی چاودێری تەندروستی، گروپێك لە پەرستارانی پیشەیی بە شێوەیەکی فەرمی رێکخران بۆ پێشخستنی سیاسەتی کار کردن و چاودێری تەندروستی لە کاری پەرستاریدا. رێکخراوی پەرستارانی سیاسەتکار لە ساڵی ١٩٧١ دامەزرا و بووە بازووی کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٧٤دا. ئەو کاتە ناوی گۆڕا بە یەکیتی پەرستاری بۆ کاری سیاسی. لەم گروپەدا پەرستاران چالاکانە لە پەرلەماندا کاریان دەکرد بۆ دانانی یاسای کاریگەر لە سەر چاودێری تەندروستی. ژمارەیەك لە رابەرانی پەرستاری هەندیك پۆستی سەربەخۆییان لە حکومەت بە دەست هێناوە. بە دەست هێنانی ئەم پۆستانە زۆر پێویستن ئەگەر پەرستاران ئۆمیدەوار بن بە بەردەوامی کاریگەری چالاکی سیاسی.

# ڕێکخراوەکانی پەرستاری

لە ماوەی گەشە کردنی پەرستاری ژمارەیەکی زۆر لە ڕێکخراوەکانی پەرستاری دروست بوون. ئەم ڕێکخراوانە لە ئاستی ناوخۆیی، وڵات، نەتەوەیی و نێونەتەوەیی دان. ئەو ڕێکخراوانەی کە زوربەی پەرستارانی باکووری ئەمریکایان لە خۆ گرتووە ئەمانەن: **کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکا، کۆمەڵەی پەرستارانی کەنەدا، یەکیتی نەتەوەیی پەرستاران، ئەنجۆمەنی نێونەتەوەیی پەرستاران و کۆمەڵەی نەتەوەیی قوتابیانی پەرستار.** هەروەها ژمارەی ڕێکخراوەکانی پەرستاری پسپۆریش زۆر بووە. بۆ نموونە **ئەکادیمی پەرستاری هەناو و نەشتەرگەری، کۆمەڵەی ئەمریکایی پەرستارانی بێهۆشکەر، کۆمەڵەی نەتەوەیی پەرستارانی ڕەش. کۆمەڵەی نەتەوەیی پەرستارانی منداڵان.** بەشداربوون لە چالاکیەکانی کۆمەڵەکانی پەرستاری، یارمەتی گەشەکردنی ئەو کەسانەی داوە کە تێیاندا ئەندامن و هەروەها یارمەتی پەرستارانی داوە کە پێکەوە کاریگەر بن لەسەر ئەو سیاسەتانەی کە کاریگەریان هەیە لەسەر کاری پەرستاری.

## کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکا

(American Nurses Association)

ئـەم کۆمەڵەیـە ڕێکخراوێکـی پیـشەیی نەتەوەییـە بـۆ پەرسـتارانی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا. لـە سـاڵی ١٨٩٦ دامـەزراوە وەك کۆمەڵـەی پەرستارانی دەرچووانی زانکۆی وڵاتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا، لـە سـاڵی ١٩١٨ناوەکەی گـۆڕا بـە کۆمەڵـەی پەرسـتارانی ئـەمریکا. یـەکێك بـوو لـە ئەنـدامانی هاوپـەیمانانی ئەنجومـەنی نێونەتـەوەیی پەرسـتاران لەگـەڵ ڕێکخراوەکانی بەریتانیای گەورە و ئەلمانیا لە ساڵی ١٨٩٩ دا. ئامانجەکانی کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکا، گەشەکردنی پێوەرەکانی کاری پەرسـتاری و پێشخستنی پەرەسەندنی پیشەیی خوێنـدنی پەرسـتارانە بـۆ ئـەوەی هـەموو خـەڵك لـە چـاودێری پەرسـتاری سـوودمەند بێـت. لەسـاڵی ١٩٨٢ دا ڕێکخراوکە بووە فیدراسیونی کۆمەڵەکانی پەرستاری وڵات. خـەڵك بەشـدار بوون لە کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکا بە ڕێگای یەکگرتنەوەی کۆمەڵەکانی پەرسـتاری وڵـات. گۆڤـاری فـەرمی ئـەم کۆمەڵەیـە "ژورنـالی ئـەمریکایی پەرستای" و ڕۆژنامەیان ناوی "پەرستاری ئەمریکا" یە.

## کۆمەڵەی پەرستارانی کەنەدایی

(Canadian Nurses Association)

ئەم کۆمەڵەیە، کۆمەڵەی پەرستارانی نەتەوەییە لە کەنەدا. پەرستاران راستەوخۆ پەیوەندی بەو کۆمەڵەیە ناکەن بەلام دەبنە ئەندام بە پێدانی ئابوونە لە لقەکانی شارەکاندا، ئەم کۆمەڵەیە بە پێوەرەکان و پرینسیپی رەوشتی و پاڵپشتی بۆ کۆمەڵەکانی شارەکان گەشەیسەندووە. هەروەها تاقی کردنەوەکانی بڕوانامە ئەنجام دەدات و یارمەتی دارایی دەداتە توێژینەرەکان، قوتابیانی زانکۆ و خوێندنی پەرستارانی کەنەدایی. گۆڤاری فەرمی ئەم کۆمەڵەیە، "پەرستارانی کەنەدایی" ە کە مانگانە چاپ دەکرێت.

## یەکێتی نەتەوەیی بۆ پەرستاران

(National League for Nursing)

ئەم یەکێتیە لە ساڵی ١٩٥٢ دامەزراوە، رێکخراوێکە هەم بۆ کەسان و هەم بۆ ئاژانسەکان. ئامانجی پەرەسەندن و پێشخستنی هەموو خزمەتگوزاریەکانی پەرستاری و خوێندنی پەرستاریە. ئەو کەسانەی کە پەرستار نین بەڵام ئارەزوویان هەیە لە بواری خزمەتگوزاریەکانی پەرستاریدا کار بکەن، بۆ نموونە بەرێوەبردنی نەخۆشخانە دەتوانێت ئەندامی ئەم یەکتیە بێت. وەها یەکێتیەك کە ئەندامی جگە لە پەرستاریش تەندروستخوازان و خەڵکی تریش بۆیان هەبێت تێدا ئەندام بن بێ وێنەیە.

ئـەم یەکێتیـە بـە بـەردەوامی ورکـشۆپ و سمینـار بـۆ بـەرزکردنی ئاسـتی ئەندامانی سـاز دەکـات. ؛ ئـەم یەکێتیـە خزمەتگوزاریـەکانی تاقیکردنـەوە دەستەبەر دەکات کە بریتین لە تاقیکردنەوەی پێگەیشتن و ئەزموونی پـێش وەرگرتن بۆ ئەو قوتابیانی کە دەیانەوێ لە پەرستاری بخوێنن. هەروەها ئەم یەکێتیـە سـاڵانە سـەرژمێری قوتابخانـەکانی پەرسـتاری و پەرسـتارە دامـەزراوەکان و دەرچـووانی ماسـتەر و دکتـورا ئـەنجام دەدات. یـەکێتی نەتـەوەیی لیژنـەی بەخـشینی بڕوانامـەی پەرسـتاری، لـە نـاو یـەکێتی نەتەوەیی بۆ پەرستاراندا سەربەخۆیە، بڕوانامە بۆ پڕۆگرامـەکانی فێرکـردن لـە پەرسـتاریدا پێـشکەش دەکـات. گۆڤـاری فـەرمی ئـەم یەکێتیـە "تێڕوانینەکانی پەرستاری و چاودێری تەندرۆستی" ە.

## ئەنجومەنی نێونەتەوەیی پەرستاران

(International Council of Nurses)

لـە سـاڵی ١٨٩٩ دامـەزراوە. پەرسـتاران لـە بـەریتانیای گـەورە و وڵاتـە یەگرتووەکانی ئـەمریکا و کەنـەدا ئەنـدامانی دامەزرێنـەری ئـەم ئەنجومەنـەن. ئەنجومـەن، فیدراسـیونی کۆمەڵـەکانی پەرسـتاری نەتـەوەیین وەك کۆمەڵـەی پەرستارانی ئەمریکا و کەنەدا.

ئەنجۆمـەنی نێونەتـەوەیی پەرسـتاران ، ڕێکخراوێکـە ئەنـدامانی کۆمەڵـەکانی نەتەوەیی تێدا پێکەوە کار دەکەن بۆ نوینەرایەتی کردنی پەرستاری لە ئاسـتی جیهاندا و پێشخستنی پیشەی پەرستاری و کاریگـەر بـوون لـە سـەر سیاسـەتی

تەندرۆستی. پێنج لە ناوەرۆکی بەهاکانی ئەم ئەنجومەنە ئەمانەن: ڕێبەری دووربین، گشتگیری، نەرمی ، هاوکاری و بەرهەم هێنان. گۆڤاری فەرمی ئەم ئەنجومەنە " پێداچوونەوەی پەرستاری نێونەتەوەیی"ە.

## کۆمەڵەی نەتەوەیی قوتابیانی پەرستاری

(National Student Nurses Association)

ئەم کۆمەڵەیە ڕێکخراوێکی پێش پیشەییە بۆ قوتابیانی پەرستاری. لە ساڵی ١٩٥٣ دامەزراوە و لە ساڵی ١٩٥٩ ڕێک خراوە وە لە بنەڕەتدا لە ژێر سەرپەرەشتی کۆمەڵەی پەرستاری ئەمریکا و یەکێتی نەتەوەیی پەرستاران کاری دەکرد. هەروەها لە ساڵی ١٩٦٨دا ئەم کۆمەڵەیە سەربەخۆیی وەرگرت ، هەرچەندە پەیوەندیەکانی لە گەڵ دوو کۆمەڵەی ناوبراو وەك خۆی ماوەتەوە. بۆ بە ئەندام بوون لەم کۆمەڵەیە قۆتابی دەبێ لە پرۆگرامێکی خوێندنی پەرستاری وڵات وەربگیرێت. دەزگای فەرمی ئەم کۆمەڵەیە گۆڤاردی "Imprint"ە.

لە کەنەدا قۆتابیانی پەرستاری ڕێکخراوێکی وەك ئەم کۆمەڵەیان هەیە بە ناوی کۆمەڵەی قۆتابیانی زانکۆی کەنەدایی. کۆمەڵەکانی تایبەت بە قوتابیانی پەرستار لە ناوچەکانی دەرەوەی پایتەخت پرۆگرامیان هەیە سەبارەت پێویستیەکانی قۆتابیان و بە گشتی گرنگی دەدەنە بواری تەندروستی.

## رێکخراوی فەخری نێو نەتەوەیی " سیگما تتا تاو"

(International Honor Society: Sigma Theta Tau)

ئەم رێکخراوە رێکخراوێکی پەرستاریە لە ساڵی ١٩٢٢ دامەزراوە. بارەگایان لە "ئیندیاپۆلسی" هیندە. پیتە یونانیەکان نیشانەی ئەم وشە یونانیەن، "ستورگا"، "تارۆس" و "تیما" بە مانای خۆشەویستی، ئازایەتی و فەخر. ئەم رێکخراوە ئەندامی کۆمەڵەی رێکخراوەکانی فەخری کۆلیژە. ئامانجی زیادتر پیشەییە تا کۆمەڵایەتی. ئەندامێتی مەرجدارە بە بەشداربوونی ئەندامانی لە ئاکادیمیەکدا. قوتابیانی بەکالوریوس لە پەرستاری و پەرستارانی ماستەر، دکتورا و پرۆگرامەکانی پاش دکتورا شیاون بۆ هەلبژاردنی ئەندامێتی لەم رێکخراوەدا. ئەوانەی دەتوانن ببن بە ئەندام کە بە لانی کەمەوە هەڵگری بڕوانامەی بەکالوریوسن، دەتوانن وەك پەرستارێکی رابەر لە کۆمەڵگادا کار بکەن. گۆڤاری فەرمی ئەم رێکخراوە گۆڤاری زانستی "پەرستاری" ە کە ساڵێ چوار جار دەردەچێت. ئەم گۆڤارە بابەتی سەرنج راکێش بۆ پەرستاران بڵاو دەکاتەوە. هەروەها رۆژنامەیەك بە ناوی " ڕەنگدانەوە" دەر دەکات کە ساڵانە چوار جار بڵاو دەکرێتەوە کە زانیاری سەبارەت بە رێکخراوەکە و کارەکانی پێشکەش دەکات.

## وەرگێر لە چەند دێرێکدا

- لە سالی ١٩٧٦ لە ئۆردگای زیوە لە ئیران لە دایک بووە.
- خۆیندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لە شاری ئەراك لە ئیران تەواو کردووە.
- لە سالی ١٩٩١لە زانکۆی ئازادی ئیسلامی ئەراك لە کۆلیژی پەرستاری وەرگیراوە
- لە سالی ١٩٩٦ بەکالوریوسی وەرگرتووە لە زانستی پەرستاری.
- لە سالی ١٩٩٨ گەرایتەوە بۆ کوردستان.
- لە مانگی ٨ی سالی ١٩٩٨ لە نەخۆشخانەی رزگاری لە هەولێر دامەزراوە.
- لە سالی ١٩٩٩ لە پۆستی سەرۆکی پەرستاران لە نەخۆشخانەی رزگاری دەستبەکار بووە.
- لە سالی بووە ٢٠٠٠ بە ئەندامی لقی هەولێری سەندیکای خاوەن پیشە تەندروستیەکان.
- لە سالی ٢٠٠١ ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری کۆلیژی پەرستاری بووە .
- لە سالی ٢٠٠٥ خوێندنی ماستەری لە زانستی پەرستاری تەواو کردووە وە پلەی ماموستای یاریدەدەری وەرگرتووە.
- ئیستاش قۆتابی دکتورایە لە زانستی پەرستاری و سەرۆکی کۆمەلەی پەرستارانە.